# ڕۆڤار

ژمارە ٧٦

ڕۆڤار، بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی
تایبەتە بەداهێنەرێکی کورد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێك دەریدەکات

سەرپەرشتیار
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
کامەران سوبحان

دەرهێنەری هونەری
ئومێد محەمەد

دیزاینی بەرگ
ئارام عەلی

تایپیست
ئارام مەحموود

هەڵەچنی
سەلام مستەفا

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

Web Site
www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی ئیمێڵی
Rovar.sardam@gmail.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

نرخ: ١٠٠٠دینار

بەرگ و پۆستەر
هونەرمەند ئاکۆ غەریب




## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە سالح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحموود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵڵا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەمەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحموودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحوی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەمەدئەمین زەکی، عەبدوڵڵا جەوهەر، مستەفا بەگی کوردی.

# پێرست

# شێرکۆ بێکەسی ڕۆڤار

ئەم ژمارەیەی ڕۆڤارمان بە قورسترین و تراژیدیترین ژمارە بۆ ئامادەکرا، هەرچەندە پێشتر و لە چەندین وێستگە و قۆناغی جیاواز و ستافی جیاوازی ڕۆڤاردا، ٧٥ ژمارەمان بۆ ٧٥ نووسەر و ڕۆشنبیریی جیاواز لە هەر چوار پارچەی کوردستان ئامادەکرد، لە هەموو ئەو ژمارانەشدا شێرکۆ بێکەس خاوەنی ئیمتیازی ڕۆڤار، ڕاستەوخۆ ڕۆڵی هەبووە لەدەرکردنیدا، بە نووسینی بابەت و شیعر و پێشنیار، ئێستا دوای ٧٥ ژمارە دەبێت بە هەمان شێواز و ماندوونەناسانە ڕۆڤارێک بۆ شێرکۆ بێکەس خۆی دەربکەین.!

لەم خولە نوێیەی ڕۆڤاردا کە بەندە و مامۆستا ڕەئووف بێگەرد کاری تێدا دەکەین، ١١ ژمارەی ڕۆڤارمان دەرکردووە، لەم ژمارانەدا شێرکۆ بێکەس لە پێش دەرکردن و لەکاتی دەرکردنیدا گەلێک سەرنج و پێشنیاری پێداوین، هەندێجاریش دوای تەواوبوون و دەرچوونی ڕۆڤار بەنامەیەک دەستخۆشی و سەرنج و پێشنیارەکانی لەسەر ئەو ژمارە نوێیەی ڕۆڤار بۆ دەناردین.

ئەو ماوەیەی کە من لە ڕۆڤاردا کارمکردووە، پێشتریش کە لە گۆڤاری ئایندە (بەڕێوەبەری نووسین) بووم و لە ڕێگەی هاوڕێم (دڵشاد عەبدوڵلا)وە ئاگاداربووم، شێرکۆ بێکەس زۆر خەمی بوو ڕۆڤارێک بۆ نووسەری ناوداری کورد (عەبدوڵلا جەوهەر) دەربکەین، دیارە پێشتر لەڕێگەی بنەماڵەکەیەوە زۆر هەوڵدرابوو، بەڵام بێ ئەنجام بوو، تا ڕۆژێکیان لە ڕێگەی بەڕێز (د.ڕەوا جەمال عەبدول)ی هاوڕێمەوە سەردانی ماڵی (قومری خانی) خوشکی عەبدوڵلا جەوهەرم کردو دواتریش ئاشنایەتیم لەگەڵ کاک (جەلالی حاجی دەروێش)ی خوشکەزای جەوهەر پەیدا کرد، ئەم ڕازەم بە مامۆستا بێگەرد گەیاند کە ئەو بنەماڵەیە پەیمانی ئەوەیان داوە سەرجەم دەستنووس و بابەتەکانی عەبدوڵلا جەوهەرمان بدەنێ بۆ ڕۆڤار. بەیانییەک کە هاتم بۆ دەزگای سەردەم هەر لەپرسگەوە (هەورامان) وتی کاک شێرکۆ ئیشی پێتە سەرێکی لێبدە، کە ڕۆیشتم وەک پیشەی هەمیشەیی، یان خەریکی نووسین بوو یان سەری بەسەر کتێبێکدا شۆڕکردبووەوەو خەریکی خوێندنەوەبوو، پێش ئەوەی دانیشم «بە پێکەنینەوە وتی «ها کامەران چیتان کرد لە ڕۆڤاری عەبدوڵلا جەوهەر؟»منیش وتم کاک شێرکۆ ئەوەی ڕاستی بێت بەنیازین کۆبەرهەمی عەبدوڵلا جەوهەر کۆبکەینەوە، ڕۆڤارێکی بۆ دەربکەین و فیلمێکی دێکیۆمێنتی لەسەر دروست بکەین.!

قاقا پێکەنی و وتی: کاکی خۆم ئێوە ڕۆڤارەکە ئامادەبکەن خوا کەریمە بۆ ئەو هەموو شتەی تر، بەهەرحاڵ زۆر قسەمان کرد، دەستی برد لە ژێر مێزەکەیەوە لاپەڕەیەکی پێدام کە شیعری (عەبدوڵلا جەوهەر سەرتاپا گزنگ سەرتاپا گەوهەر) بوو، وتی ئەگەر توانیمان و ڕۆڤارمان دەرکرد ئەم شیعرەی منیش دابنێن، پێم خۆش نەبوو لەوێدا بۆی باس بکەم کە چ ئامادەکارییەکمان کردووە بۆ ڕۆڤار، ئەوەشم پێنەوت کە ئێستا بەشی هەرە زۆری دەستنووس و ڕۆمان و پەخشان و شیعر و کتێبەکانی عەبدوڵلا جەوهەر لای منە، سبەی بەیانی کە هاتم بۆ سەردەم وەک هەندێ لە ڕۆژانی تر کە چوومە لای کاک شێرکۆ بینیم «مامۆستا ڕەئووف بێگەرد»یش لای دانیشتووە، کاتێک بە یەک فەردەی گەورە کە ٥٤ دەفتەری گەورەی دەستنووسی عەبدوڵلا جەوهەر بە خەتی خۆی، چەندین نامە، زیاتر لە ١٥٠ وێنەی کە پێشتر تەنها چەند وێنەیەکی بینرابوو، بەڵام لەو وێنانەی من پەیدام کردبوو، لە تەمەنی ٧ ساڵییەوە بۆ مردنی تێدا بوو، وتم ئەوە سەرجەم بابەت و نووسینەکانی ڕۆڤار، دیارە بنکەی ژین بە سوپاسەوە لەدەستکەوتنی بەشێکی ئەم بابەتانەدا ڕۆڵی هەبوو، (بەتایبەتیش دەفتەرێکیان کە هەندێ بابەتی جەوهەری تێدا بوو کە (ئومێد ئاشنا) ئامادەی کردبوو، ئێستا بە هاوبەشی دەزگای سەردەم ئەو کتێبەمان چاپ کردووە) هەستێکی زۆر خۆشم لە ڕوخساری ئەودا بەدیکرد، ڕەئووف بێگەرد بەرامبەری دانیشتبوو، بە پێکەنینەوە بە کاک شێرکۆی وت «ئێمە ئاوا ئیش بۆ ڕۆڤار دەکەین.!» شێرکۆ بێکەس زۆر پێکەنی و وتی دانیشە. وابزانم ئەو دانیشتنەم درێژترین دانیشتنی ١٢ ساڵی تەمەنم بوو لە دەزگای سەردەم لەگەڵ ئەودا، ئیدی کەوتە قسەکردن لەسەر ئەوەی چۆن ئەو کتێبانەی لەسەردەم چاپ بکەین، چۆن ڕۆڤارێکی شایستەی بۆ دەربکەین، کێ بەرهەمی تێدا بنووسێت، چۆن هاوڕێ نزیکەکانی بدۆزینەوە، هەموویمان کرد و توانیمان ئەوەی ویستمان لەسەر عەبدوڵلا جەوهەر بۆ یەکەمین جار لە کوردستاندا و لەدوای ٢٨ ساڵ بەسەر

کۆچی دوایی ئەودا کۆبەرهەمی لە دەزگای سەردەم لە کۆتایی مانگی ئابی ئەمساڵدا چاپ بکەین، ڕۆڤارەکەش لە مانگی نیساندا بڵاوببێتەوە، فیلمێکی دێکیۆمێنتیش لەسەر جەوهەر دروست بکەین، دیکۆمێنتییەکەش لە دەرهێنانی خەسرەو حەمەکەریم و بەرهەمهێنانی کۆمپانیای ڕوداو، لەم دێکیۆمێنتەریەدا مامۆستا عومەر مارف بەرزنجی ڕۆڵێکی زۆر جوامێرانەی بینی، وەک هاوڕێیەکی نزیکی جەوهەر زۆر هاوکاری کردین، ئەمانەمان هەمووی کرد، لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبونە بۆ ئەم کارە هەروا فەرشی سوورمان بۆ ڕانەخرابوو، لێرەو لەوێ زۆر شتمان پێوترا، گەردنیان ئازابێت و هەمیشە سەر بڵند بن و بەختەوەر بن.!

لەدواهەمین نامەی شێرکۆ بێکەس کە لە ڕۆژی ٦-٤-٢٠١٣ لە دەزگای سەردەم بۆ ڕەئووف بێگەرد نووسیوویەتی و لە ئەرشیفی ڕۆڤاردا ئەو نامەیە پارێزراوە، چەند خاڵێک لەسەر ڕۆڤار دەنووسێت، گرنگترینیان باس لەوە دەکات تا دێمەوە لەوسەفەرە ئەو سێ بەرگەی بەرهەمەکانی (عەبدوڵڵا جەوهەر) چاپ بکەن، لەگەڵ چەند خاڵێکی تری تایبەت بە ڕۆڤار، بەڵام بەداخەوە شێرکۆ بێکەس نەهاتەوەو کتێبەکانی عەبدوڵڵا جەوهەر لە سەردەم چاپ بوون.

هەر ئەو ڕۆژەی نامەکەی تێدا نووسیبوو، پێش نیوەڕۆکەی شێرکۆ بێکەس وەک پیشەی هەمیشەیی کاتێک سەفەری دەرەوەی وڵاتی دەکرد بەسەر کارمەندەکاندا دەگەڕا، کە چوومە ژوورەکەی مامۆستا ڕەئووف بێگەرد، دانیشتبوو کەمێک قسەمان کرد، بەشێکی زۆری ئەو خاڵانەی کە لە نامەکەدا نووسیبوونی باسی کردەوە، ئەوەندە نەبێت باسی گۆڕەکەی (عەبدوڵڵا جەوهەر)م بۆ کرد کە لەگۆڕستانی چوارباخ لە شوێنێکی چەپەک و بێ خزمەتگوزاریدایە، ڕویکردە کاک ڕەئووف و پێیوت «کە هاتمەوە بە جوانترین شێوە گۆڕەگەی جەوهەر نۆژەن دەکەینەوە، چونکە ئەوە مامۆستامانە و مافی بەسەر هەموومانەوە هەیە.»

لەبەر هەموو ئەمانە، بە نیگەرانییەکی زۆرەوە ئەم سەروتارەی ئەم جارەمان بۆ یەکێک لە ئەندامە کاراکانی ستافی ڕۆڤار نووسی، کە ڕەنگە هەرگیز بە بیری مامۆستا ڕەئووف و مندا نەهاتبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان دوای مەرگی کاک شێرکۆ ڕۆڤاری لەسەر دەربکەین، ئێمە پێشتر کە ڕۆڤارمان بۆ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەد ئەمین زەکی بەگ و حەمەی مەلا کەریم و تۆفیق وەهبی و سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، نالیو مەحوی دەردەکرد ئەو پێشنیار و سەرنج و تێبینی دەدا پێمان، ئەی بۆ ڕۆڤاری شێرکۆ بێکەس، چاوەڕێی سەرنج و تێبینی کێ بین؟!

ماڵئاوا شێرکۆی ڕۆڤار، ماڵئاوا شێرکۆی هەموان.

## بەڕێوەبەری نووسین







# ژیاننامەی شاعیری ناوداری کورد شێرکۆ بێکەس

ڕۆڤار

شاعیری ناوداری کورد شێرکۆ بێکەس، لە تەمەنی ٧٣ ساڵیدا لە نەخۆشخانەیەکی سوید کۆچی دوایی کرد، ئەم شاعیرە ناودارەی کورد کوڕی فایەق بێکەس و دایکی ناوی شەفیقە سەعیدی وەستا حەسەنە، شێرکۆ لە ١٩٤٠/٥/٢ لە گەڕەکی گۆیژەی شاری سلێمانی لە دایکبووە.

تەمەنی هەشت ساڵان بووە بێکەسی باوکی، واتە لەساڵی ١٩٤٨ لە هەڵەبجە کۆچی دوایی دەکات.

منداڵیی و لاوێتی شێرکۆ بێکەس پڕ بووە لە ئازار و ژانی بێکەسی و ناڵەباری رەوشی ئابوری.



شێرکۆ بێکەس لەتەمەنی ٢٠ ساڵیدا

لە نێو هەڵومەرجی سەخت و بێکەسیدا قۆناغی ئامادەیی تەواو کردووە.

تەمەنی حەڤدە ساڵان بووە یەکەمین شیعری لە رۆژنامەی ژین بڵاو کردۆتەوە.

ساڵی ١٩٦٥ دەبێت بە پێشمەرگە و لە رادیۆی دەنگی کوردستانی عێراق لە ئەشکەوتی سەردێمان دەست بە کار دەکات.

ساڵی ١٩٦٨ یەکەمین کۆمەڵە شیعری بە ناوی تریفەی هەڵبەست بڵاو دەکاتەوە.

ساڵی ١٩٦٩ لەگەڵ خاتوو نەسرین میرزا ژیانی هاوسەری پێک دەهێنێت.

لەگەڵ سێ هاوڕێی تری ئەدیب و نووسەریدا، حوسێن عارف، جەلال میرزا کەریم و کاکەمەم بۆتانی، ساڵی ١٩٧١ بەیانی روانگە لە پێناوی نوێکردنەوەی ئەدەب و نووسینی کوردی بڵاودەکەنەوە.

ساڵی ١٩٧٤ دووبارە دەبێتەوە بە پێشمەرگە.

پاش تێکچوونی شۆڕش بەرەو خوارووی عێراق، شاری رومادی، دوردەخرێتەوە.

ساڵی ١٩٧٩ دەگەڕێتەوە سلێمانی.

ساڵی ١٩٨٤ بۆ پشتگیری شۆڕش و هێزی پێشمەرگە و هەروەها بۆ ئەوەی خۆی لە وەرگرتنی خەڵاتی (قادسیەی سەدام) بپارێزێت/ جارێکی تر روو لە چیاکانی کوردستان دەکاتەوە و دەبێت بە پێشمەرگە.

ساڵی ١٩٨٦ بە هۆی تێکچوونی باری خراپی کوردستان و هێرشە بێئامانەکانی کیمیابارانەوە، پێشنیازی بۆ دەکەن بەرەو دەرەوەی وڵات بچێت.

ساڵی ١٩٨٦ دەگاتە ئیتالیا.

ساڵی ١٩٨٧ لە سوێد خەڵاتی تۆخۆڵسکی وەردەگرێت. خەڵاتەکەی لە لایەن سەرۆک وەزیرانی ئەو دەمی سوێد (ئیگڤار کالرسۆن)ەوە پێشکەش دەکرێت. پاشتر هەر لەو وڵاتە دەمێنێتەوە و دەبێت بە هاووڵاتی سوێد.



**نەسرین ئەحمەد میرزا - شێرکۆ بێکەس**

ساڵی ١٩٩٢ لە یەکەمین کابینەی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا دەبێت بە وەزیری رۆشنبیری.

ساڵی ١٩٩٨ لەگەڵ کۆمەڵێ هاوڕێی نووسەر و رۆشنبیریدا دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دروست دەکەن و دەبێت بە سەرۆکی ئەو دەزگایە.

ساڵی ٢٠٠٩ سەرجەمی بەرهەمەکانی لە هەشت هەزار لاپەڕەدا چاپ کرد.

شێرکۆ بێکەس خاوەنی دەیان کۆمەڵە شیعر و نزیکەی دە هەزار لاپەڕە شیعری رەنگاو ڕەنگە.

خاوەنی چەندین ئەزموونی جۆراوجۆرە لە نووسینی شیعردا. ئەو بە شیعر شانۆنامە، پۆستەر، دەقی کراوە، داستان و گەلێ بەرهەمی تری ئەدەبی نووسیوە.

شیعری شێرکۆ بێکەس بۆ زۆر زمانی وەکو ئینگلیزی، فەرەنسی، ئەڵەمانی، ئیتاڵی، سوێدی، عەرەبی، تورکی، فارسی و هی تریش وەرگێڕدراون.

دواهەمین دیوانە شیعری بە ناوی (یادەوەری پاسکیلێکی کەرکوکی) نووسیوە، بەڵام مەرگ ڕێگەی تەواوبوونی نادات. ئێستا ئەم دیوانە شیعرییە بە تەواونەکراوی لەدوای شاعیر ماوەتەوە و بڕیارە لە داهاتوودا هەڵۆی کوڕی تەواوی بکات.

رۆژی ٢٠١٣/٨/٤ لە وڵاتی سوێد و لە ئەنجامی نەخۆشیدا شێرکۆ کۆچی دوایی دەکات. کۆچێک زیانێکی گەورەی لە دوای خۆی بۆ ئەدەبیاتی کوردی و نەتەوەی کورد بەجێدەهێڵێت. لەسەر وەسێتی خۆی تەرمەکەی لە پارکی ئازادی لە شاری سلێمانی بە خاک سپێردرا، بڕیارە لە داهاتوودا گۆڕەکەی بکرێتە مۆنۆمێنتێکی دیاری هونەری.

## سەرنجێکی پێویست:

**ئـەم وتـارەی بەڕێز مـەریـوان وریـا قانع، پێشتر بەشێکی لـە ڕۆژنـامـەی ئاوێنە بڵاوکردووەتەوە، بەڵام لەم وتارەی ڕۆڤاردا بە دورودرێـژی هەڵوێستەی کردووە لەسەر شێرکۆ بێکەس و کورد بوون.**

**ڕۆڤار**

لە ژیانی هەموو میللەتێکدا هەندێک ڕووداوی ناخۆش هەن کە دەبنە بەشێک لە "یـادەوەری گشتیی" ئەو میللەتە و ساڵانێکی درێژ لەگەڵ نەوە جیاوازەکانی ئەو میللەتەدا دەمێننەوە، لە مێژووی ئێمەدا، بۆ نموونە، ڕووداوی شەشی ئەیلولی ١٩٣٠، لە سێدارەدانی سەرۆک کۆماری مەهاباد، هەرەسی ساڵی ١٩٧٥، کیمیابارانکردنی هەڵەبجە و پەلامارەکانی ئەنفال لە ساڵی ١٩٨٨دا، کۆڕەوە تراژیدییەکەی ساڵی ١٩٩١، گرتن و فڕاندنی عـەبدوڵـڵا ئـۆچ ئـالانـی سـەرۆکـی پـارتـی کرێکارانی کوردستان، تیرۆرکردنی عەبدولڕەحمانی قاسملۆ و هاوڕێکانی، بەردبارانکردن و کوشتنی دوعا، تیرۆرکردنی سێ خانمە تێکۆشەرەکەی کوردستانی باکوور لە پاریس، هتد... هەریەکێک لەو ڕووداوانە ڕەهەندێکی نیشتمانی و نەتەوەیی و ئینسانی گرنگیان هەیە، بەشێوازی جیاواز و لە دەروازەی جیاوازەوە بە مێژووی میللەتی ئێمەوە گرێدراون، هەم بەشێکی گرنگن لەو مێژووە و هەم لەزۆر ڕووەوە دروستکەری ئەو مێژووەن. پێموایە مردنی شێرکۆ بێکەسیش ڕووداوێکی لەو بابەتەیە، شتێکە ساڵانێکی درێژ لەگەڵماندا دەمێنێتەوە، نەوە جیاوازەکانی دونیای ئێمە بەشێوازی جیاواز یادیدەکەنەوە و بەشێوازی جیاواز لەگەڵیدا دەژین. ئەم پیاوە بەهەقیقەت موڵکی هەموو پارچەکانی کوردستان و موڵکی شیعر و موڵکی داهێنانە، پیاوێکە وەک درەختێکی بەرز لەناو مێژووی ئێمەدا وەستاوە، ئەوانەی ڕێیان دەکەوێتە ناو ئەم مـێـژووەوە و بەناویدا تێدەپەڕن، دەبێت ساتێک لە سێبەری ئەو درەختەدا ڕاوەستن و لە ڕەگ و قەد و گەڵا و گوڵ و بۆن و لەرینەوەکانی ئەو درەختە ڕابمێنن.

ئەم پیاوە_درەختە ساڵانێکی درێـژە دەستی لەناو دروستکردنی هۆشیاریی میللەتی ئێمەدایە، هۆشیاری بەرامبەر بە خود خۆی و بەرامبەر بە دوژمـن و بە دۆستەکان، بەرامبەر بە شیعر و بە زمان و بە نووسین، بەرامبەر بە قووڵی و درێژی برینەکان و بەرامبەر بە خەبات و کۆست و تێکشکاندنەکان. شێرکۆ بێکەس یەکێکە لە کەسایەتییە بنەڕەتییەکانی سەدەی بیستەمی مێژووی ئێمە، نووسەرێکە لە هەموان باشتر ماناکانی بوونی ئێمەی وەک میللەتێکی بریندار لەو سەدەیەدا بەرجەستەکردووە.

## کوردبوون وەك گوناهی یەکەم

ئەگەر بکرێت ئەزموونی ئەدەبی شێرکۆ بێکەس لە ڕستەیەکدا کورتبکەمەوە، دەکرێت بڵێم ئەوەی ئەم شاعیرە لەناو ساڵە تاریکەکانی سـەدەی بیستەمدا ئەنجامیداوە، گواستنەوەی ئەزموونی کوردبوونە بۆ نـاو شیعر، کردنی شێوازە جیاواز و دەرکەوتە جیاوازەکانی کوردبوونە بە شیعر. بەڵام کوردبوون بە چ مانایەک و لە کام دید و گۆشەنیگاوە؟ بێگومان کوردبوون بەمانا ناسیۆنالیستییە بەرتەسکەکەی نا، بەمانا ئەتنیە داخراوەکەی نا، بەڵکو کوردبوون وەک دۆخی دەرکردنی کۆمەڵێک مرۆڤ بەزۆر بۆ دەرەوەی مێژوو و دەرەوەی زەمـەن، وەک گوناهێکی گـەورە بەرامبەر بە مرۆڤ، وەک هێما بۆ پرۆژەیەکی گەورەی وێرانکردنی ئینسان لە دونیای هاوچەرخدا. لەڕاستیدا لە ئەزموونی شێرکۆ بێکەسدا دەرکردنی کورد لە مێژوو وەک دەرکردنی ئینسان وایە لە بەهەشت، دروستکردنی ئێش و ئازار و وێڵگەردییەکی بێوێنەیە، توڕدانی مرۆڤە بۆ ناو دونیایەکی ناحەز و پروکێنەر. شێرکۆ بێکەس ئەم دەرکردنەی کورد لە مێژوو وەک "گوناهی یەکەم"، نزیک لەو گوناهەی لە مەسیحیەتدا نـاوی "گوناهی بۆماوە"ی لێدەنێن، دەبینێت. گوناهێک کە دەبێتە هۆی دروستبوونی قوربانییەک کە خۆی بەرپرس نییە لە دۆخی بەقوربانیبوونی، قوربانییەک سەدەی بیستەم وەک گشتێک بەرپرسە لە دۆخی بە قوربانیبوونی. بەڵام هاوکـات ئەم قوربانییە بوونەوەرێکە تەسلیمی دۆخی

قوربانیبوونەکەی خۆی نابێت، خەونێکی بەردەوام بۆ ساتی بەر لە بەقوربانیبوون، بەر لە دەرکردن و تورڕدانەوە دەرەوەی مێژووەوە دەبینێت، نەک هەر خەونبینین، بەڵکو لە دۆخی ئیشکردنێکی سەرسەخت و بەردەوامیشدایە بۆ گەڕانەوە بۆناو مێژوو. بەم مانایە شێرکۆ بێکەس ڕەهەندێکی دینی و گەردونی قووڵ بەکوردبوون دەبەخشێت، وەک دۆخێک تەریب بەدۆخی دەرکردنی مرۆڤ لە بەهەشت و هەوڵدانێکی تراژیدی بۆ گەڕانەوە بۆ بەهەشت وێنایەدەکات، وەک هەوڵی ڕزگاربوونێکی قورس و نزیک لە مەحاڵ، هاوکات هەوڵێک پڕ لە ڕۆحی نەبەزین و کۆڵنەدان و پڕ لە ئیرادەی بەردەوامی و برێکی گەورە لە ئیستاتیکای شۆڕش و یاخیبوون. ئەوەی لە ئەزموونی ئەم پیاوەدا دەیبینین کوردبوونە بەو مانایانەی سەرەوە، کوردبوونە وەک ڕۆحێکی بریندار کە تەسلیمی برینەکانی نابێت، وەک جۆرە مرۆڤبوونێکی ڕێزلێنەگیراو کە تەسلیمی سوکایەتییەکان و ڕێزلێنەگرتنەکانی نابێت. ئەمانەن وادەکەن کوردبوون لە شیعری شیرکۆدا چەند چیرۆکی مرۆڤێکی تێکشکاو و بەناهەق دەرکراوبێت بۆ دەرەوەی زەمەن و دەرەوەی مێژوو، ئەوەندەش چیرۆکی مرۆڤێکی یاخی و نارازی و بەرگریکەربێت، چەند بوونەوەرێکی شەلاڵی خوێن و ماندوو و بێبڕست بێت، ئەوەندەش چیرۆکی بوونەوەرێکی خاوەن ئیرادە و خاوەن وزەیەکی ئەفسانەیی ڕۆیشتنی بەردەوام و گەڕانی سەرسەختانەی بێکۆتایی بێت بەدوای ئازادبوون و دۆزینەوەی ماڵێکی تاکەکەسی و نیشتمانی و ئینسانیدا، شوێنێک مرۆڤ بتوانێت مرۆڤبوونی خۆی سەربەرزانە لەناودا نیشتەجێبکات و بۆ ساتێک بێ سوکایەتیپێکردن و ئازاردان و ئیهانەکردن لەگەڵ مرۆڤبوونی خۆیدا بژی. لەم ئەزموونەدا ئیستاتیکای وێرانکاری و یاخیبوون بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەیەکدی تێکەڵبوون و ئەو ئەزموونە تایبەتەیان دروستکردووە کە ناوی ئەزموونی کوردبوونە: کوردبوون بەهەموو خەم و پەژارە و برین و، خەون و ئومێد و چاوەڕوانی و، جوانی و ناشیرینی و، تێکشکان و هەستانەوەکانییەوە. کورد وەک سیزێفێک کە گەمە گەورەکانی سەدەی بیستەم دروستیدەکات، بەڵام سیزیفێک ئومێدی ئەوە لەدەستنادات لە غەفڵەتێک لەغەفڵەتەکانی مێژوودا و لە سەدەیەک لە سەدە ئاڵۆزەکاندا لە سیزێفیەت ڕزگارییبێت، گەر تەنانەت لەڕێگای ناردنی نامەشەوە بێت بۆ خودا، نامەیەک کە نە بگاتە دەستی خودا و نە بەو زمانەش نووسرابێت کە لە ئاسمان قسەی پێدەکرێت. ئەم مانا تایبەتەیە وایکردووە شیعری شێرکۆ بێکەس لەهەرشتێک بێئومێد بووبێت لە کوردبوون بێئومێد نەبووبێت، کوردبوون هەم وەک شوناسی سەرەکی شیعری شێرکۆ و هەم وەک هێمایەکی تووڕە بۆ سەردەمێکی ناهەموار لە مێژووی مرۆڤایەتی و هەم وەک کردەی یاخیبوونێکی تراژیدی لەزیاد لە فۆرمێکدا بمێنێتەوە. شیعری شێرکۆ شیعری سەردەمێکە پڕ لە تاوان و ژەهرکوژکردن و لەناوبردن.

هەرکەسێک سەرنجێکی خێرا لەکارە شیعرییە زۆرەکانی ئەم پیاوە بدات سەری سوڕدەمێنێت لەناوی ئەو هەموو مرۆڤ و شاخ و گوند و شار و لادێ و شەقام و کۆڵان و قەڵا و بەرزایی و شەهید و گۆرانیبێژ و شاعیر و پێشمەرگە و عاشق و ئافرەت و کرێکار و قوتابی و مۆسیقار و خائینە کوردانە کە لە جوگرافیای فراوانی ئەم شیعرەدا ئامادەن. مرۆڤ لەبەردەم کارە ئەدەبییەکانی ئەم پیاوەدا وا هەستدەکات گەر ئەم شاعیرە بیتوانیایە و بۆی بکرایە هەموو کوردی، مرۆڤ بە مرۆڤ و دەغڵ بەدەغڵی، دەخستە ناو شیعرەکانییەوە و دەیگەڕاندنەوە بۆ ئەو سەرەتای سەرەتایانەی کە مرۆڤ تیایدا دەبێت بە مرۆڤ بەمانا ئینسانی و ئەخلاقی و ئیستاتیکییەکانییەوە، بۆ ئەو زەمەنەی کە ڕێ لەوەدەگرێت مرۆڤ شوێنێکی پەراوێزیی پێببەخشرێت. کە دەڵێم هەموو کورد، باس لە شوناسێکی ئەتنی ناکەم، بەڵکو مەبەستم سەرتاپای ئەو دونیا و دۆخە تراژیدییەیە کە شوناسی کوردبوونی وەک یەکێک لە قوربانییە گەورەکانی سەدەی بیستەم دروستکردووە، باس لەدۆخی منداڵێک دەکەم لە قەڵایەکی سەخت دەرکرابێت و هەموو دەرگاکانی ئەو قەڵایەش بەجۆرێک هەڵچنرابن هەموو ڕێگاکانی بەڕووی گەڕانەوەی ئەو منداڵەدا داخستبێت. بەڵام منداڵێک کۆڵنەدات لە هەوڵی گەڕانەوە بۆ ناو ئەو قەڵایە، بەهەموو ئازار و گرفت و نەهامەتیی و نائومێدییانەوە کە ئەم هەوڵی گەڕانەوە زەحمەت و هەندێکجار مەحاڵە، دەیناهێنێتە کایەوە. هەوڵدانێک وەک وتم سەرێکی لەناو ئیستاتیکای وێرانکاری و دەرکردندایە و سەرەکەی تری لەناو ئیستاتیکای شۆڕش و یاخیبووندا.

## شیعر وەك ویژدانی مێژوو

بەم مانایە شێرکۆ بێکەس شاعیرێکە ناتوانین دایببڕین لە مێژووی پڕ لە کەوتن و هەستانەوەی سەدەی بیستەمی میللەتی ئێمە، ناتوانین وەک ویژدانی ئەو مێژووە و





ڕەنگی ئاوی- هونەرمەند ئاکۆ غەریب

وەک بەرجەستەکەرێکی ڕاستگۆی ئومێد و نائومێدی و کارەسات و یاخیبوونەکانی ئەو مێژووە نەیبینین. شیعری شێرکۆ تەنها نیشتمانی مرۆڤە بریندار و یاخییەکان نییە، بەڵکو ژینگەی هەموو ئەو باڵندە و درەخت و شاخ و بەرد و کۆڵانانەشە کە بەشێکن لەو مێژووە و بەسەدان شێوەی جیاواز لەو مێژووەدا و لە شیعری شێرکۆدا تێکەڵن بە ئومێد و نائومێدی و ئیرادە و بێئیرادەیی ئەو مرۆڤەوە کە ناوی کوردە و بەو کێشەیەشەوە کە ناوی کێشەی کوردبوونە. لە ئەدەبیاتی هاوچەرخی ئێمەدا کەم نووسەر هەیە وەک شێرکۆ بێکەس باوەشی بەم گشتە گەورەیەدا کردبێت و لەگەڵ خۆیدا ئەو هەموو ساڵە درێژانەی سەدەی بیستەمی، بەهەموو دووکەڵ و ئاگر و دڵشکان و مژدەکانییەوە، بە ناوەوەی خۆی و بە دونیادا گەڕاندبێ. من هیچ شاعیرێکی تر ناناسم بەڕادەی شێرکۆ بێکەس باوەشی بەمێژووی نیشتمانەکەیدا کردبێت و ئەو مێژووەشی بەهەموو برین و پێکەنین و کارەسات و سەرکەوتن و ناشیرینی و جوانییەکانییەوە بۆ ناو شیعر گواستبێتەوە. ئەزموونی شێرکۆ بێکەس ئەزموونی گرێدانێکی ئەبەدیی و ئەخلاقی و شیعرییانەی پیاوێکی داهێنەر و ناسکی کوردە بە مێژووی سەخت و ئاڵۆز و خوێناوی میللەتێکەوە کە لە هەموو ساتێکی ئەو مێژووەدا چەندەها دڵۆپە خوێن و چەندەها دڵۆپە ئومێد و چەندەها دڵۆپە فرمێسکی چاندووە. دەڵێم ناتوانم بیر لە شاعیرێکی تر بکەمەوە لەم پەیوەندییە فاوستییەدا بێت بە نیشتمانەوە، مەگەر مەحموود دەروێشی فەلەستینی لێدەرچێت. ڕەنگە تەنها مەحموود دەروێش بەڕادەی شێرکۆ بێکەس بە مێژووی میللەتەکەی خۆیەوە گرێدرابێت و فرمێسک و خوێن و ئومێد و نائومێدی ئەو

مێژووەی کردبێت بەشیعر. ئەم دوو شاعیرە پەیمانێکی میتافیزیکی لەنێوان شیعر و مێژوودا دروستدەکەن، لە شیعرەوە دەچنە ناو مێژوو و لە مێژووشەوە دەچنەوە ناو شیعر.

ترسێکی زۆرم هەیە مردنی شێرکۆ بێکەس مانای هەتیوکەوتنی ئەو مێژووە بێت، نەمانی دەنگێک بێت وەک ئەم پیاوە لەیەککاتدا لەسەر برین و کارەساتەکان و تریفەکان ئامادەبێت و لە شیعردا بیانکات بە برین و کارەسات و تریفەی نیشتمانی و ئینسانی، بیانکات بە بڕێک لە ئومێد و چاوەڕوانی و خەونی هاوبەش. نیشتمانی ئێمە بە مردنی ئەم پیاوە شاعیرێکی لەدەستدا کە بێ نیشتمان شیعری بۆ نەدەگوترا. لە مێژووی شیعری دونیاشدا کەم شیعری باش و سەرکەوتوو هەیە وەک شیعری شێرکۆ بێکەس هەم شیعر بێت و هەم نیشتمان.

## کوردبوون و بۆشایی

کوردبوون بەو مانایانەی سەرەوە لە شێرکۆ بێکەس بسێننەوە بۆشاییەکی گەورە و قووڵ، نەک تەنها دەکەوێتە ناو سەرجەمی ئەزموونە ئەدەبییەکەیەوە، بەڵکو ناو بوونی خۆشییەوە وەک مرۆڤێک، وەک کەسێک کە سەفەرێکی کورت و خێرا بەناو دونیادا دەکات و دواتریش لە قوژبنێکی ئەم ئەستێرەیەدا، دوور لە نیشتمانی خۆی، دەمرێت. شێرکۆ بێکەس بۆ هەر شوێنێک ڕۆیشتبێت، بۆ هەر کەسێک قسەی کردبێت، لەههر شار و کۆڵانێکی دونیادا ژیابێت، ههر کوردبووە، کوردبوونی خۆی بەکۆڵییەوە بووە و بردوێتی بۆ هەموو شوێنەکانی دونیا. ئەگەر دونیا کۆڵانێکی گەورەبووبێت شێرکۆ بێکەس وەک کوردێک لەو کۆڵانەدا ژیاوە. بەڵام ئەم کوردبوونە، ئەم ئامێزانبوونە بە مێژووی میللەتێکی بریندار، چەند خاڵێکی پڕ دڵنابیە لە ئەزموونی ئەم پیاوەدا، واتە شێرکۆ چەند گومانی لەوە نەبووە کە شاعیرە و شاعیرێکی کوردە، هاوکات ئەم کوردبوونە بەهەمان ڕادە هاوشانبووە بەدڵەڕاوکێ و قەلەقێکی ئەدەبی و شیعریی گەورە، بەچۆنیەتی تەعبیرکردن لەم کوردبوون و شاعیربوونە، لەم گونجاندنەی کوردبوون و شاعیربوون و کوردبوون و شیعریەت، مێژوو و ئیستاتیکا لەگەڵ یەکدا. کەم شاعیری کورد هەن بە ڕادەی شێرکۆ بێکەس شاعیرێکی ئەزموونگەر، واتە "تەجریبی" بن، خاوەنی ئەزموونێکی درێژی نووسینی جیاواز و دەربڕینی جیاواز و بابەتی جیاواز و زمانی جیاواز و ئیقاعی جیاواز و دەرکەوتنی شیعریی جیاواز بووبن. بەهەموو مانایەک شێرکۆ بێکەس شاعیرێکی ئەزموونگەرە، ڕۆحێکی گۆڕانخواز و بێئۆقرە لەسەرجەمی کارەکانی ئەم پیاوەدا ئامادەیە. لەو شوێنانەدا کە خوێنەر چاوەڕوانی ئەوەیە کە بوەستێت، یان نوچێک بدات، یان جگەرەیەکی پشوودان دابگیرسێنێت، ڕێک لەوێدا سەرلەنوێ دەستپێکردۆتەوە و سەرەتایەکی نوێی کێشاوە. ئەوەی لەسەرجەمی کارەکانی ئەم شاعیرە ڕابمێنێت بۆی دەردەکەوێت ئەم پیاوە لە هیچ گۆشەیەکی شیعریی و لەناو هیچ ڕووبەرێکی نووسیندا پشووینەداوە. شێرکۆ بێکەس لە جۆری ئەو شاعیرانەیە کە هەمیشە دەڕۆن و هەمیشە بەڕێوەن، لەم ئەزموونەدا گرنگ نییە بۆ کوێ دەڕوات، گرنگ نییە بەکوێ دەگات، گرنگ ئەوەیە نەوەستێت و سەرسامییەکانی بەڕێوەبوون و ڕێگاکردن ئەزموونبکات. شێرکۆ وەک مرۆڤ دەمرێت بەڵام ئەزموونی بەڕێوەبوون و ڕێگاکردنە شیعرییەکەی بەردەوامدەبێت. خۆی وەک جەستە لێرە نییە بەڵام هەم تارماییەکەی و هەم ڕێگاکان و هەم سەفەرەکانی لەگەڵمانن. دونیای شیعری ئەم پیاوە پڕیەتی لە شیعری هەمەجۆر، شیعری کورت و درێژ، سادە و ئاڵۆز، شانۆی شیعری و نامەی شیعری، ڕۆمانە شیعر و شیعری مەلحەمی، پۆستەرە شیعر و شیعر وەک ئاوێنەی بچووک، شیعری مەنفا و شیعری ناو کەشکۆڵی پێشمەرگە، شیعری ئومێد و شیعری نائومێدبوون هتد... بەبۆچوونی من ئەم ڕۆحە شیعرییە پڕ دڵەڕاوکێ و پڕ جوڵە و پڕ نەحەسانەوەیە، بەشێکە لەنیوسەدە هەوڵدانی ئەم شاعیرە بۆ تەرجەمەکردنی کوردبوونی خۆی بۆ وێنە و زمان و ئیقاعی ناجێگیر و جیاواز و پڕجوڵە. ئەزموونی ئەم شاعیرە ڕوانینە لەخۆی و لەکوردبوون لەدەیان گۆشەنیگای جیاوازەوە، ڕازینەبوونە بەدانیشتن بەدیار یەک وێنە و یەک چیرۆک و یەک شێوازی تەعبیرکردن، چ لەخۆی و چ لەکوردبوون، وەک دوو دەرکەوتی سەرەکی ئینسانبوون لە یەکێک لەسەدە هەرە سەختەکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا، مەبەستم سەدەی بیستەمە.

## ئازادی و خۆشەویستی و شەهیدبوون

پێموایە ئەو یاسا نەنووسراوەی سەرجەمی کارەکانی ئەم شاعیرە گەورەیە ئاراستەدەکات، کۆکردنەوەی ئەم سێ تەوەرە سەرەکییەیە بەیەکەوە، مەبەستم کۆکردنەوەی



ئـازادی و خۆشەویستی و شەهیدبوونە بەیەکەوە. ئەوانەی بەشیعری ئەم شاعیرە ئاشنان بەئاسانی ئەو ڕاستییە دەبینن کە شیعری شێرکۆ بێکەس شیعری گەڕانێکی بەردەوامە بـەدوای ئازادیدا. ئەو دونیایەی شێرکۆ بێکەس تێیدا ژیا، ئەو نیشتمانەی قەدەر کردی بەنیشتمانی ئەم شاعیرە و ئەو مرۆڤانەی لەگەڵیاندا ژیا و خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیانی لەگەڵدا بەشکردن، دونیا و نیشتمان و مرۆڤی ئازاد نەبوون. هەموویان بەر ئازار و لەعنەتی سەندنەوەی ئازادیی کەوتبوون. ئەمە وادەکـات گـەڕان بـەدوای ئـازادیـدا، هەوڵدان بۆ بەرجەستەکردنی ئازادی، هێنانی ئازادی بۆ ناو ژیان و پەیوەندییەکان و شیعر، بەشێکی گەورەی ئەزموونی شیعریی شێرکۆ بێکەس بێت. شێرکۆ کە ئازادی لەناو دونیا و پەیوەندییەکان و ژیانی مرۆڤەکاندا نادۆزێتەوە، هەوڵئەدات، لانیکەم خۆی، لەناو شیعرەکانیدا ئازادبێت، هەوڵئەدات خولیای خۆی بۆ ئازادی وەک هێزێکی گەورە، فڕێبداتە ناو زمان و ناو شێواز و ناو بابەتە شیعرییە جیاوازەکانییەوە. لەم ڕووەوە شیعری شێرکۆ شیعرێکە لە هیچ وێستگەیەکدا ناوەستێت، لەناو هیچ سیحرێک لەسیحرەکانی زماندا جێگیر نابێت، هیچ ئەزموونێکی نووسینیش نابێتە دواهەمین ئەزموونی ئەم شاعیرە. گەڕان بـەدوای ئازادیدا و دروستکردنی ئەم ئازادییە لە شیعردا، وادەکەن ئەم شاعیرە لەدۆخی دڵەڕاوکێ و گەڕانێکی بێکۆتاییدا بێت. ئەو نایەوێت لەناو یەک دەرکەوتی ئازادیدا تا ئەبەد بژی، ئەو لەناو ئازادی خۆیدا بەدوای ئازادی زیاتر و قووڵتردا دەگەڕێت، ئازادییەک بـەردەوام ڕووبـەڕووی ئەزموونی ئینسانی و ئەزموونی شیعریی تری بکاتەوە. ئەگەر ڕۆژە درێژ و قورسەکانی سـەدەی بیستەم ویستبێتیان ئـەم پیاوە بەدەیەها سنووری ئەستور و بازنەی داخراو گەمارۆ بدەن،، ئەوا شیعر ئەم پیاوەی کردووە بە بوونەوەرێکی کۆچەریی، بەگەڕیدەیەکی هەمیشەیی بێماڵ، بەکەسێک هەم ئازادی خۆی لەناو شیعرەکانیدا بژی و هەم شیعرەکانیشی وەک ناڕەزاییەکی گەورە بەڕووی دونیایەکی نائازاددا بەرزبکاتەوە. شیعر وەک کردەی ئازادبوون خۆی و وەک ئامرازی سەرەکی گەیشتن بە ئازادی خۆشی.

بـەڵام ئەزموونی شیعری شێرکۆ بێکەس ئەزموونی گۆڕینی ئازادیی نییە بۆ دۆخێکی نەفسی ناوەکی، ئەزموونی ئیشراق و داگیرسانێکی ناوەکی نییە وەک لای سۆفییەکان دەیبینین، ئەم ئازادییە ئازادییەکی نەفسی نییە داپچڕاو لە دونیا، گەڕانەوە و نووقمبوون نییە لەناو خود خۆیدا، بازدانێکیش نییە بەرەو موتڵەق و باوەشکردنیش نییە بە ئاسمانێک لە ئاسمانەکاندا. لەهەمانکاتدا ئازادییەکیش نییە تەنها لە ڕێگای ئەزموونکردنی شیعرەوە، لە ڕێگای دەسکاریکردن و تازەکردنەوەی بەردەوامی زمان و وێنە و تێکستەکانەوە بەدەستیبهێنێت. ئـازادی لـە شیعری شێرکۆدا نە ئازادییەکی سۆفییانە و نە ئازادییەکی تێکستیانەیە، ئازادییەک نییە مرۆڤ لە نـاوەوەی خۆیدا، یان لەناو زماندا بۆییگەڕێت، بەڵکو ئازادییەکی سەرزەمینیی و دونیایی و مێژوویی و جوگرافی و ماتریالییە، ئازادییەکی بێشوناس نییە، ئازدییەکی کۆنکریتە، مـرۆڤ لەناو موتڵەق و خود خۆیدا بۆیناگەڕێت، بەڵکو لەناو دونیا و لەناو پەیوەندی و لەناو ژینگە تایبەتەکاندا بەدوایدا دەگەڕێت. جگە لەمە ئازادی شێوازێکیشە لە بیرکردنەوە مرۆڤ تیایدا دوورتر لەخودی خۆی دەڕوات و دوورتر لەخودی خۆی دەبینێت. ئـازادی لە ئەزموونی ئەم شاعیرەدا بەشێکە لەکردەی دوورتـر بینین و دوورتر ڕۆیشتن لە ڕێگای یاخیبوونی سەرزەمینیانەی مرۆڤەوە لەناو مێژوو و کۆمەڵگە و لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا. ئازادی کۆتاییهێنانە بە هەموو ئەو بەربەستانەی کە ناهێڵن بڕۆین و ببینین، لە شیعری شێرکۆدا ئەم کۆتاییە پرۆژەیەکی دەستەجەمعی دونیاییە. ئەگەر هێزێکی گەورە مرۆڤی لە بەهەشت دەرکردبێت، ئەوکات هیچ شاعیرێک بەهێزی خۆی و بەهێزی زمان بەتەنها ناتوانێت بۆ ئەو بەهەشتە بگەڕێتەوە. مرۆڤی دەرکراو لە بەهەشت پێویستی بە ئازادییەکی هاوبەش و پێکەوەییە بۆ گەڕانەوە بۆ بەهەشت. بەبۆچوونی من ئەم تێگەیشتنە بۆ ئـازادی کۆڵەکەی سەرەکی ئەزموونی شیعریی و هەڵوێستی حەیاتی شێرکۆ بێکەسە. ئەم تێگەیشتنەیە وادەکات شێرکۆ هەم خۆی خەباتکەرێکی سیاسی بێت، هەم لەناو شۆڕش و یاخیبوونی کۆمەڵگەکەیدا بژی و بەشداربێت، هەم شیعرەکانیشی بەشێکبن لەکردەی فراوانکردنی ڕووبەرەکانی یاخیبوون لەناو نووسین و ژیانی ڕۆژانـەی مرۆڤەکاندا، هەم خۆشی وەک شاعیر بـەردەوام لە دۆخـی یاخیبووندابێت بـەڕووی زماندا و خەریکی بەجێهێشتنی ئەو سنوورانەبێت کە زمان دروستیاندەکات و وەک بەربەست لەبەردەم ئازادیدا بەرزیاندەکاتەوە. شێرکۆ بێکەس لە شیعردا دەیتوانی بچێتە ئەودیوی سنوورە ناوەکییەکانی زمان و سنوورە

ناوەکییەکانی شیعرەوە، بەڵام بۆ گەیشتن بە ئازادی ئەم دەرچوونە ناوەکیی و شیعرییەی پێ کافی نەبوو. ئاخر ئەو دونیایەی شێرکۆ بێکەسی تێدا ژیا، دونیایەک بوو پڕ لە مرۆڤ و باڵندە و سروشتی دیل و کوژراو، سیخناخ بە بای ژەهراوی، پڕ لە فڕۆکەی جەنگی و بۆمبای هەمەجۆر، لێوانلێو لە عاشقی کوژراو و نائومێد، مرۆڤی ڕووتکراوە لەمرۆڤبوون و میللەتی فڕێدراو بۆ دەرەوەی مێژوو. ئەم شتانە وادەکەن ئەو ئازادییەی ئەزموونی شیعری شێرکۆ بێکەس بەدوایدا دەگەڕێت، ئازادی ڕۆحیی ئەم یان ئەو داهێنەر نەبێت بەتەنها، هەروەها ئازادی ئەم ئینسان یان ئەویتریان نەبێت وەک تاکەکەس بەتەنها، بەڵکو ئازادی ئەو دونیا بریندار و ئەو مێژووە بێمێژووە و ئەو میللەتە دەرکراوانەبێت کە وەک گشت نائازاد و ناسەربەخۆن. ئازادی لێرەدا ئازادییەکی کۆیی و دەستەجەمعییە، هی هەموان بۆ هەموانە، ئازادی ئینسانە لەناو دونیا و لەگەڵ دونیا و ئەوانیتردا، لەناو ئەو ژینگە و نیشتمانانەدا کە مرۆڤ و موقەدەس و سروشتی سووتاو دروستدەکات. بەڵام شێرکۆ بێکەس لەناو ژیاندا و لەگەڵ ئەوانیتردا، لەهەر پرۆژە و کارێکی پێکەوەییدا بەشداربووبێت، شیعری ئامرازی سەرەکی و ماتریالی هەرە گرنگی ئەو بووە بۆ هەڵکەندنی بەردەوامی ئەو ئازادییە لەناو ڕەگی ئەو مێژووە و لەسەر بەردی ئەو دونیایە. شێرکۆ کە ئازادی لە شیعردا وەک ڕۆیشتن بۆ ئەودیوی زمان و ئەودیوی داڕشتنەکان دەبینێت، لە دونیادا وەک کردەی ڕۆیشتن بۆ ئەودیوی ڕیزبەستنی ئێستای پەیوەندییەکان و ئیشکردنی قەدەرەکان و نەفرەتی لەعنەتە مێژووییەکان دەبینێت.

## عەشق، یان خۆشەویستی

دەمەوێت لێرەوە بپەڕمەوە بۆ بابەتی دووەم لە شیعری شێرکۆ بێکەسدا کە بابەتی عەشق، یان خۆشەویستییە. هەموو خوێنەرێکی سادەی کارەکانی شێرکۆ بێکەس ئەوە دەبینێت خۆشەویستی چ ڕووبەرێکی گەورەی لە ئەزموونی ئەم شاعیرەدا داگیرکردووە. بەبۆچوونی من ئەزموونی خۆشەویستی لە شیعری شێرکۆدا پەیوەندییەکی پتەو و ڕاستەوخۆی بەئەزموونی ئازادییەوە هەیە بەو مانایەی لەسەرەوە بە ئازادیمان بەخشی. واتە ئازادی وەک پرۆژەیەکی گەورەی سەرزەمینی و هاوبەش لە نێوان مرۆڤەکاندا. خۆشەویستی لێرەدا تەواوکەری ئەو ئازادییەیە، یان ڕەنگە مەرجی سەرەکی گەیشتن بەو ئازادییە بێت. لە خۆشەویستیدا مرۆڤ ئەتوانێت





شێرکۆ بێکەس لەگەڵ شەفیقە خانی دایکیدا

بازبدات، باز بەسەر حەز و تەماحە تایبەتەکانی خۆیدا بدات، دەتوانێت خودی خۆی تێپەڕێنێت، قازانج و دەسکەوتە تایبەتەکانی خۆی لەبیربکات. خۆشەویستی پێکەوەبوونێکی ناسک و باوەشکردنێکی پڕ شەوق و پڕ ئولفەتی ئازادانەی مرۆڤەکانە بەیەکتریدا. وەکچۆن ئازادی شتێک نییە بە ئینسان درابێت، بەڵکو ئینسان دەبێت دروستیبکات، خۆشەویستیش شتێکە دروستدەکرێت، دادەڕێژرێت و گەشەی پێئەدرێت و خەمی بۆدەخورێت. لە شیعری شێرکۆدا خۆشەویستی وەک کوردبوون وایە، شتێکە دەستەجەمعی و ئینسانی، هەوڵدانێکە بۆ پاککردنەوەی مرۆڤ لە خڵتەکانی ناو دونیا. شێرکۆ وەکچۆن لە کوردبوون بێئومێد نابێت ئاواش لە خۆشەویستیش بێئومێد نابێت. لە شیعری شێرکۆدا خۆشەویستی وەک ئازادی هەمیشە ئامادەیە، هەمیشە دروستدەکرێت و بەردەوام پێویستی بە پاراستن و تازەکردنەوەیە. خۆشەویستی کەی مرد دەشێت زیندوو بکرێتەوە، جارێک بە شیعر و جارێک بە شۆڕش و یاخیبوون و جارێکیش لەڕێگای تێکەڵکردنی تەنیایی دوو ئینسانەوە بەیەکتریی. لای شێرکۆ بێکەس وەکچۆن کوردبوون هێمایە بۆ دۆخێک مرۆڤ تیایدا بەدوای ئازادیدا دەگەڕێت و ڕێزی ئازادی دەگرێت، ئاواش مەرجی سەرەکی لە عەشقی ڕاستەقینەدا ڕێزگرتنی ئازادیی کەسەکانە لەیەکتری، خۆشەویستی مرۆڤ بۆ مرۆڤ هەم خۆی خۆشەویستییەکی ئازادە، هەم خۆشەویستی دوو مرۆڤیشە بۆ ئازادیی.

لە بەشێکی زۆری شیعری شێرکۆدا خۆشەویستی هێزێکە دژ بەکۆیلەیەتی و دژ بەشکاندنی ئیرادە و دژ بەداماڵینی مرۆڤەکان و نیشتمانەکان و مەسەلەکانە لە شوناسی خۆیان، بەرگرییە لەو شتانەی ئەو کەسانە دەکەن بەکەس و ئەو نیشتمانانە بەنیشتمان و ئەو مەسەلانەش بەمەسەلە. خۆشەویستی مانای ڕێزگرتنی تایبەتمەندیەتییەکانی یەکتری، لە تایبەتمەندێتی مەعشوقەوە بۆ تایبەتمەندێتی نیشتمان. لە شیعری شێرکۆدا خۆشویستنی کوردستان، خۆشویستنی شەهیدان، خۆشویستنی منداڵان و گەنجان، خۆشویستنی خانمان، مانای پاراستنی هەموو ئەو شتانە بەو شێوەیەی خۆیان دەیانەوێت هەبن و ببن. مانای ئەوەی کوردستان بتوانێت کوردستانبوونی خۆی بژی، شەهیدان بتوانن شەهیدبوونی خۆیان بژین، منداڵان بتوانن منداڵبوونی خۆیان بژین، گەنجان و ئافرەتان بتوانن گەنجبوون و ئافرەتبوونی خۆیان بژین. پاراستنی ئەم تایبەتمەندییانەش تەنها کردەیەکی تاکەکەسی نین، بەڵکو پرۆژەی دەستەجەمعی و پێکەوەیین و لێرە و لەم ساتەدا پێویستیان بە بونیادنان و دروستکردن هەیە. لەم ئاستەدا تەماهییەکی گەورە لە شیعری شێرکۆدا لە نێوان خۆشەویستی و ئازادیدا هەیە و زۆرجار وەک دوو دەرکەوتی سەرەکی ژیان دەردەکەون کە کەسیان بێ ئەویتریان ناژی. بەڵام ژیان تەنها وەک ژیان نا، وەک شتێک نا کە بەشێوەیەکی سروشتی بە مرۆڤ بەخشرابێت، بەڵکو ژیان وەک بەشێک لە کردەی ئازادیی، ژیانێکی ئازادانە، بەدوور لە هەموو جۆرە سوکایەتیکردنێک بە مرۆڤ. ئەم گرێدانە سەختەی خۆشەویستیی بەئازادییەوەیە وادەکات بابەتی شەهید و شەهادەت یەکێک بێت لە بابەتە سەرەکییەکانی ناو شیعری شێرکۆ بێکەس.

## شەهید

شەهید لە شیعری شێرکۆدا بوونەوەرێکی مەرگدۆست نییە، مرۆڤێک نییە بەدوای مردنی خۆیدا وێڵبێت، کەسێک نییە نەیەوێت بژی، یان لە ژیان هەڵبێت، یان تەماحی لەوەبێت بەهەشتێکی ئاسمانی و لەشکرێک پەری بباتەوە. بەپێچەوانەوە شەهید لە شیعری شێرکۆ بێکەسدا بوونەوەرێکە هەم عاشقە و هەم ئازاد، هەم دونیاییە و هەم ڕۆژانەیی، هەم سادەیە و هەم ئاڵۆز. شەهید لای شێرکۆ بێکەس تێکەڵێکی گەورەیە لە خۆشەویستی و ئازادی، لە سەودایەکی بەرپرسیار و لەگەڕانێکی بێماندوبوون بەدوای ئازادیدا، لە عەشق بۆ ژیان و لە عەشق بۆ نیشتمان. لەڕاستیدا ئەو خاڵەی کە تەوهەری عەشق و خۆشەویستی و ئازادیی لە شیعری شێرکۆدا بەیەکەوە کۆدەکاتەوە و بەیەکتریان تێکەڵدەکات، شەهادەتە. شەهادەت کردەی قوربانیدان نییە بەتەنها، بەڵکو کردەی کۆکردنەوەی پارچە جیاوازەکانی ژیانە بەیەکەوە بۆ کردنیان بە گشتێکی قابیلی ڕێزگرتن و قابیلی ژیان. شەهید لە ئەدەبیاتی ئەم پیاوەدا ناوێکی ترە بۆ مرۆڤێکی عاشق و جەنگاوەرێکی ئازاد، هێمایەکی ڕاستەوخۆیە بۆ مرۆڤێک ئەوەی کە دەیجوڵێنێت هەم خۆشەویستییەکی قووڵە بۆ خۆی و بۆ دونیا و بۆ ئەوانیتر و هەم گەڕانێکی پڕ مەترسی و ڕیسکاویش بەدوای ئازادیدا. شیعری شێرکۆ بێکەس ڕووبەرێکی ڕەمزی بەرفراوانە بۆ کۆکردنەوەی ئازادی و

خۆشەویستی و شەهادەت بەیەکەوە. شەهید ناوکێکی ترە بۆ ئازادی و عەشق، ئازادی عەشقێک مرۆڤ بتوانێت لەناو دونیادا پیادەیانبکات.

## لە وێرانەیەکی ئینسانییەوە بۆ دونیایەکی ئینسانی

شێرکۆ بێکەس پیاوێکە بەقووڵی هەردوو دەستی لەناو مێژووی سەدەی بیستەمی ئێمەدایە. پیاوێکە بەناو ئەم مێژووەدا دەگەڕێت و پارچە سوتاو و کوژراو و خنکاو و وێرانکراوەکانی کۆدەکاتەوە و بە مەراقێکی زۆرەوە دەیانباتە ناو ماڵی شیعرەوە، بە ئومێدێکی زۆریشەوە دەیەوێت لەو ماڵە شیعرییەوە بیەڕێتەوە بۆ ناو مێژوویەکی پاکتر و جوانتر و ئینسانیتر. شیعری شێرکۆ ئەزموونی سوڕانەوەیەکی بەردەوامە بەناو وێرانەیەکی ئینسانی گەورەدا و تۆمارکردنی رووکارە خەمبار و ڕۆژانەییەکانی ئەو وێرانەیە، بەڵام ئەم تۆمارکردنە تەنها بۆ ئەوە نا ئەو دونیایەمان لەبیرنەچێتەوە کە وێرانە و میللەتێکی تێدا دیلکراوە، بەڵکو بۆئەوەی بتوانین ئەو وزەیە لەناو خۆمان و لەناو مێژوودا دروستبکەین کە بتوانێت ئەو وێرانەیەمان بۆ بگۆڕێت بە دونیایەک قابیلی ژیان. دونیایەک بتوانین تیایدا هەم عاشق بین و هەم ئازاد. ئیستاتیکای شیعری شێرکۆ بێکەس ئیستاتیکای بینین و هەستپێکردن و هەوڵدانی گۆڕینی ئەو وێرانە ئینسانییەیە بە دونیایەکی ئینسانی. مرۆڤ کە لە بەهەشت دەرکرا دوو ئەگەری لەبەردەمدایە، یان ئەوەتا تەسلیمی ئەم قەدەرە سەختەی دەرکردن دەبێت و لەچاوەڕوانی مردندا دادەنیشێت، یان ئەوەتا هەموو هێزی دەخاتەکار بۆ گەڕانەوە بۆ بەهەشت، لەهێزی ئیرادەوە بۆ هێزی زمان و لە هێزی ئەخلاقەوە بۆ هێزی ئیستاتیکا. شێرکۆ بێکەس لەجنسی ئەو مرۆڤانەیە کە بەردەوام عەوداڵی ئەگەری دووەمین. پیاوێکە دەیەوێت لەگەڵ خۆیدا بمانبات بۆ بەهەشت، بەهەشتێک لێرە و لە ئێستادا، لە سبەینێ و دووسبەی دونیادا، بەهەشتێک لەگەڵ مرۆڤەکانی تر و لەپاڵ عەشق و ئازادی و شیعردا. بەهەشتێک نا لە ئایدیۆلۆژیایەک لە ئایدیۆلۆژیاکانەوە هاتبێت، بەڵکو لەباوەڕی ئینسانەوە بە مرۆڤ و عەشق و ئازادی و بە دونیایەکی باشتر و بە مێژوویەکی جوانتر و ئینسانیترەوە هاتبێت.

لە هەمووشی گرنگتر شێرکۆ بێکەس پیاوێک بوو ڕاستگۆ بوو لەگەڵ بیرکردنەوە و عەقڵ و هەستکردنەکانی خۆیدا. بێ شەرمکردن ئەوەی بەڕاستی دەزانی دەینووسی، ئەوەی بەهەقی دەزانی بەرگریلێدەکرد و چیشی بە شایانی هێرشکردنە سەر زانیبێت، هێرشی کردۆتەسەر. کەی بەپێویستی زانیبێت بچێتە سەر شەقامەکان و ناڕەزایی دەربیڕێت چووە، کەیش باوەڕی وابووبێت پێویستە بەرگری لەم یان لەو هێزی کۆمەڵایەتی بکات، کردوویەتی. لەم ساڵانەی دواییدا ئەم پیاوە بە حەفتا ساڵ تەمەنەوە لەناو خۆپیشاندانەکاندا، لەناو ناڕەزایی دەربڕینەکاندا، لەناو کەمپینە جۆربەجۆرەکاندا، ئامادەبووە. هەموو قورساییە شیعری و ڕەمزییەکەی خۆی دەخستە پاڵ هەموو ئەو مەسەلە و رووداوانەوە کە بەشایستەی بەرگریلێکردنی دەزانین. لەمەشدا عەقڵ و تێگەیشتنی خۆی وەک شاعیرێک مەحەکی بوو. شێرکۆ بێکەس لە مێژووی ئەدەبی و ئیستاتیکی سەدەی بیستەمی ئێمە دەربهێنە، نەک تەنها کەلێنێکی گەورەی تێدەکەوێت، بەڵکو زیاد لە پایەیەک لە پایە سەرەکییەکانی دەڕوخێت.

## شێرکۆ بێکەس و من

ئەوەندەی بیرم بێت من تا ئێستا سێ جار بۆ مردووەکان گریاوم، ساڵی پار بۆ دایکم کە لەپڕ و بێهیچ پێشینەیەک لە ڕووداوێکی هاتوچۆدا کۆچیی دوایی کرد، ساڵی ١٩٨٣ بۆ پۆلێک لە پێشمەرگەی هاوڕێ و دۆستی ڕاستەقینە و دێرینم، ئەم چەند ڕۆژەی دواییش چەند جارێک بۆ شێرکۆ بێکەس. یەکێک لەو هۆکارانەی وا لەمن دەکات کوردبوونی خۆمم خۆشبوێت و ڕێزێکی تایبەتم بۆ ئەو ڕاستییە هەبێت کە کوردم، بوونی ئەزموونی شیعریی و ئیستاتیکی ئەم پیاوەیە. بەدرێژایی ساڵانێکی درێژ ئەم پیاوە چەندەها جار رووە جوانەکانی کوردبوون و رووە جوانەکانی زمانی کوردی وەک زمان و رووە جوانەکانی شیعری وەک تۆمارێکی ویژدانی بۆ خەمە قووڵەکانی مرۆڤ، نیشاندام. ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی تا ئەو سێ شتە مابن، مەبەستم تا کوردبوون و تا زمانی کوردی و تا جوانیی مابێت، ئێمە لەگەڵ ئەم پیاوەدا بمێنینەوە.

ئەمستردام

مانگی ٨ ساڵی ٢٠١٣







# شێرکۆ بێکەس..
# وەك خۆی

ڕەووف بێگەرد

قسەکردن لەسەر شێرکۆ بێکەس، قسەکردنە لەسەر کەسێکی نائاسایی کە ناتوانرێت تەنیا لەسەر نەمانە فیزیکییەکەی بدوێیت و بە پێی زانیارییە ئاساییەکان پێکهاتە و هاوکێشەکانی هەڵبسەنگێنیت. ئەمەش خەسڵەتی هەموو ئەو کەسانەیە کە وەک ئەنجام ڕەهەندێکی ڕەمزی لەخۆدەگرن و توانای هێشتنەوە و قۆرغکردنیان لە چوارچێوە و مەودایەکی دیاری کراودا مەحاڵە. شێرکۆ بە جەستە مرۆڤێکە وەک هەر مرۆڤێکی تر، بەڵام ئەوەی سنووری ئەو پێکهاتەیە دەبەزێنێت جیاوازییە لە دەربڕینە فرە جەمسەر و فرە وێنە و زمانە هەرە تایبەتیەکەی کە کەسایەتییەکی دەگمەنی پێ دەبەخشێت. ئەو لە زمانی وتندا کە بە شیعر دەری دەبڕێت، دەگاتە سنووری ئەفسانە و بەزاندنی دەوروبەرەکەی. تەنانەت بەزاندنی ڕابردووی شیعری کوردیش کە تا ڕادەیەکی زۆر لە هەندێک بڕگەی ئەو کاروانەدا و لەسەر ئاستی چەند ناوێکی گەورەیاندا سەرسام و تەواو سەرمەست بوو. بەڵام ئەو هەرگیز نەبوو بە شاگردی کەسیان و ڕێچکە تایبەتیەکەی خۆی کە وەک ئەنجام دەکرێت بە شێوازی شێرکۆیانە ناوزەدبکرێت لەبەرگرت و پەرەی پێدا. شێرکۆ داهێنەری شێوازی تایبەتییە لە شیعردا، چ لەسەر ئاستی بابەت و چ لەسەر ئاستی فۆرم. لە شیعری هەرە کورتەوە بیگرە تا قەسیدەی هەرە درێژ. لە مێژووی ئەدەبی ئێمەدا، بەتایبەتی لە شیعردا، نموونەی دەربەندی پەپوولە و خاچ و مار و ڕۆژمێری شاعیرێک و ئەسپێک لە پەڕەی گوڵاڵە و ئێستا کچێک نیشتمانمە و گۆڕستانی چراکان، بەو نەفەس و ڕۆحە درامییەوە تا ئێستا نییە. بە ڕاستی نیشتمانی شێرکۆ بێکەس شیعرەکانیەتی. بەتایبەتیی قەسیدە درێژەکانی کە مێژووی ڕاست و دروستی نەتەوەکەیین بە هەموو جوانی و دزێوییەوە، بە شکۆمەندی و شکستیەوە، بە دیمەنی برینداری خوێن لەبەر ڕۆیشتووی و گەشبینی ئایندەیەوە. وەک خۆی دەڵێت: من شاعیری نەخشەیەکم بەکام زەڕەبینی وردی مێژوو هەیە تەماشای بکەم شوێنێکی ساغ بە جەستەیەوە نابینم، لە شیعری شێرکۆدا هەموومان وەک کورد و وەک مرۆڤ خۆمان دەبینینەوە. لە هەرە ئاشقی شەیدامانەوە کە خۆشەویستەکەی لەگەڵ خۆدا تـەلان تـەلان و ڕەوەز بە ڕەوەز و کـۆڵان بە کۆڵان دەگێڕێت، تا دڵشکاوترین کەسمان، لە ترسنۆکەوە تا چەلەنگ و ئازامان. لە پێشمەرگەوە تا خۆفرۆشمان، لە شەڕەنگێزەوە تا ئاشتیخواز و مرۆڤدۆستمان. هـەمـوومـان کـاراکـتـەری نێو دیـوانـەکـانـی شێرکۆ بێکەسین. شێرکۆ بە زمانی باڵندە دەدوا و لەگەڵ ئاسک و درەخت و کورسی و کڵاو و خۆر و باراندا دەرگای لەسەر نهێنیەکانی زمان دەکـردەوە. زمانی گیاندار و بێگیانەکان، مرۆڤ و ئاژەڵەکان، باڵندە و ماسیەکانی دەریا، هەمووشی زمانی کوردین وەک پێکهاتە نەتەوەییەکە و وەک کارەسات و کەوتن و هەستانەوەکانی. با بزانین ڕیشۆڵەکەی شێرکۆ بێکەس چۆن چیرۆکی ئێستای خۆی و ڕابردووی دەگێڕێتەوە:

**من ناوم ڕیشۆڵەیە**
**لە دەمێکەوە لەو شاخ و داخانە**
**تەتەری هەڵۆ و بازە نێرەکان و**
**نامەبەری نێوان شەقامەکانی شار و**
**کێوەکان بووم. ئەوەندە هاتم و چووم**
**تا باڵەکانم سوا و کەسیرە بووم**
**وا ئێستایش گەڕاومەتەوە شار و**
**نە هەڵۆی پیر و نە هەڵۆی گەنج و کەس،**
**هیچ کەس**
**منیان هەر لە بیرنەماوە**
**کەس، هیچ کەس.**
**تەماشاکە! چش لە باڵم**
**بەڵام وا خەریکە ڕسوا ڕسوا**
**لەسەر سەقفی ناو گەراجدا**
**لە برساندا بۆخۆم دەمرم.**

ئایا ئەمە سکاڵای ڕیشۆڵەیەکە، یان ناڵە و هاواری تێکۆشەرێکی دێرینی ئەم سەردەمەیە؟!
شێرکۆ لەو ڕابردووە بێزارە کە بە دەگمەن ڕووناکی تیا دەرکەوتووە، مێژوویەکە پڕ لە شیوەن و گریان،



لێوانلێو لە ناپاکی و غەفڵەت و چەوساندنەوە و بەهەدەردانی ڕەنجی تێکۆشەر و مرۆڤە بەهیممەت و هێژاکان. ئەو خەون بە دنیایەکی تازەوە دەبینێت کە لە سایەیدا میللەتەکەی بە ئازادی بژی و بەهرە لە تواناکانی وەربگرێت. بۆیە نەترسانە ڕەخنە دەگرێت و بەرگریی لە مافی ڕەوای خەڵک و ئازادیی ڕادەربڕین و یەکسانیی کۆمەڵایەتی دەکات. ئەو مێژوویەک ڕەت دەکاتەوە کە ئەم خەسڵەتانەی تیا نییە:

(( من ناتوانم مێژوویەکم خۆشبوێت هەر بۆنی بۆکڕووزی پرچ و جەستەی ژنی لێبێت. ناتوانم ئاوێنەیەکم خۆش بوێت و بچمە بەری کە شەو و ڕۆژ ئەلبوومەکانی خوێن و تۆڵەم نیشان بدات. ناتوانم باوکێکم خۆش بوێت لە پێناوی ڕابردوودا بژی و بمرێ. ناتوانم نا، من ئێستا نیشتمانی خۆم دۆزیوەتەوە، نیشتمانی تازەی من کچێکە لە نیشتمانە پیر و عەبووسەکەی ئێوە ناچێت. ڕوونترین ئاو لە چاوی ئەودایە، درەخت و گیا و گوڵ و زنوێر لە جەستە و باڵا و شان و مل و گەردن و نێوان مەمانی ئەودایە. من ئیتر نامەوێ لەو نیشتمانە بێ خەونەی ئێوەدا بژیم. من دەمەوێ بچمە ناو گەردوونی ڕەنگاڵەی ئەو کچەوە، ئەو سیحرەوە، لەوێدا خەو ببینم. لەوێدا شیعر بنووسم. لەناو ئەودا بخوێنمەوە و پیاسە بە کەنارەکانی دڵنیایی دا بکەم

بێزاربووم لەو هەموو تیغەی سەربڕین

لەو هەموو ڕەشەبای ڕقە، لەو هەموو دارستانی تۆڵەیە

بێزارم لەو هەموو دارستانی تۆڵەیە، لەو هەموو حیکایەتە ژەنگ گرتوانەی کە لە منداڵییەوە گوێیان تەفرەدام، چاویان لێ دزیم، هەستیان بە سڕبوون سپاردم.))

شێرکۆ هەر لە ڕابردوو بێزار نییە کە بەردەوام ڕەتی بکاتەوە و دیمەنە دزێوەکانی بهێنێتەوە یادمان بۆ ئەوەی لەوە زیاتر ئەو درۆیانە نەسەلمێنین کە لە منداڵییەوە بە ناهەق فێریان کردووین. بەڵکوو ئەو لە ئێستایش جاڕزە کە جارێکی تر هەمان ئەو ڕابردووانەمان بۆ دووبارە دەکەنەوە و بە پێی نەخشەی بە گەمژەکردن و بە گەوجیی ژیان بەسەربردن مامەڵە لەگەڵ ئەقڵماندا دەکەن. لای شێرکۆ ڕابردوو ئەوەندە پیرۆزیی نییە جارێکی دی پەیڕەویی لە نەریتە باوەکانی بکەیت و هەوڵی پاراستنیان بدەیت و بە بیانووی هێشتنەوەی کولتووری باو و باپیرانەوە ڕێزیان لێ بگریت، نا، ئەو دەزانێت کارکردن بۆ سەقامگیرکردنی پرۆسەیەکی لەو بابەتە زیان گەیاندنە بە تەواویی کولتووری ئەم نەتەوەیە، بە ئایندەی نەوەکانی، بە تازەبوونەوەی ژیان و ڕەوتی شارستانیەتی پێشکەوتووی ئەم سەردەمە کە نەتەوەکەی ئەو لەدوای هەرە دواوەی کاروانەکەدایە.

**((بەیانیتان باش، من ناوم دیوارە**
**کەوتوومەتە سەر شەقامێکی گشتی**
**بە درێژایی بێزاری درێژم و**
**بە بەرزیی تووڕەبوونیشت بەرز**
**هەرچی دروشمەکانە بە مندا هەڵدەواسرێن.**
**هەرچی پۆستەرەکانە لە من دەدرێن. لە**
**سەد دروشم یەکێکی تیانییە**
**شتێکم فێربکات.**
**لەسەد پۆستەر یەکێکی تیا نییە**
**دڵم خۆش بکات.**
**هەر دوێنێ بوو**
**لە سەرمەوە تا کەڵەمووستی پێم**
**دروشمێکیان پیا هەڵواسیم**
**کە خوێندمەوە**
**شەرم تەریقی کردمەوە.**
**من دیواری وڵاتێك بم**
**درۆی کەتە و گەورەی وەهای پیا هەڵواسرێ))**

**((ئەم مێژووەی من خەم ساردە**
**گالیسکەیەکە تا پەناگوێی ئەسپەکانی**
**لە ڕابردوودا چەقیون و... باکی نییە**
**دەرگای ساڵ و دەرگای هەتاوی داهاتووی**
**لێ کەوتووە و بۆی ناگەڕێ و باکی نییە))**

مێژوو لای شێرکۆ ڕوویەکی قێزەونە بەردەوام هەڕەشەمان لێ دەکات، هەڕەشەی خۆدووبارە کردنەوە، هەڕەشەی مەرگ و نەهاتی، هەڕەشەی دەست و پێ بەستن و هەنگاونان. هەڕەشەی شکستی بەردەوام و دڵەڕاوکەی بەردەوام.

**چاوەڕێی چی ئەکەیت مێژوو؟**
**وا لەم دووڕیانی شارەدا، شپرزە و دڕدۆنگ وەستاوی**
**چاوەڕێی کێ ئەکەیت مێژوو؟ شەڕ یان ئاشتی؟**
**ئێمە هێشتا کراسە بەدبەختیەکانی شەڕی ناوخۆمان**
**دانەکەندووە... مێژوو**
**ئێمە تازە لە ئاشتی بەهارێکمان گەڕاوینەتەوە... مێژوو**
**دیسانەوە بەتەمای کام کۆستی تری... مێژوو؟**

شێرکۆ لە ئامادەگیی ناو ئەدەبیی کوردیدا لەو گڕکانانە دەچێت کە بەردەوام چاوەڕێی تەقینەوەیان لێ دەکرێت. بەو مانایەی کە مردنێکی وا نییە بتوانێت بۆ هەمیشە کپی بکات و دەسەڵاتە گەورە و توانا کەم وێنەکەی لە بواری داهێنانە شیعرییەکەیدا تەواو لە گەڕ بخات. شێرکۆ دەیزانی بە جەستە ئیتر لە ناوماندا نامێنێت و بەمزوانە دەمرێت. ئەمە ڕاستییەکە زیاد لە ساڵێک لەمەو بەرەوە من لە چاو و قسەیدا هەستم پێ کردبوو. من کە ڕۆژانە دەمبینی ئەو هەستەم لا دروست بووبوو کە شێرکۆ پەلەی بەرهەمهێنانی هەندێک لەو کارە ناوازانەیە کە تا ئەوکاتە فریای کردنی نەکەوتووە. جا چ لەسەر ئاستی شیعر بێت، یان لە پێداچوونەوەی پەیوەندییەکانیدا کە دەیویست ئەو هەڵەیەی ڕەنگە بەسەریدا تێپەڕیوە. ئەو دڵەی نەیزانیوە بۆ ڕەنجاندویەتی، ئەو کەسەی لەخۆوە ناتەبایی لەگەڵدا دەکات بیانخاتەوە سەر پەردەی یادەوەری خۆی و دوا دەفتەری یاداشتەکانی وەک دڵە منداڵەکەی و خۆشەویستیە هەمیشە زیندووەکەی بە سپیەتی



ڕەئووف بێگەرد — د. مارف خەزنەدار — شێرکۆ بێکەس / ١٩٧٢



بهێڵێتەوە... جارێک لێی پرسیم باشە بۆ فڵانە کەس لەناو هەر کۆڕ و کۆبوونەوە و دانیشتنێکدا بە خراپی باسم دەکات؟ تۆ هیچی لێ دەزانیت؟ دوای کەمێک بیرکردنەوە و گەڕان بۆ هۆکارێک هیچم دەستگیر نەبوو. وتم مەسەلەکە تەنیا تۆ نیت، خەمی پێ مەخۆ. ئەو برادەرە زمانی بۆ کەس بە خێر ناگەڕێت. وتی بۆ تۆش؟ وتم بەڵێ، زۆرم لێ بیستۆتەوە، وتی ئەو نەخۆشی زمانە دەرمانی نییە؟ وتم تازە بڕوا مەکە، چونکە زۆرجار باجەکەی داوە، بەڵام دەرسی لێ وەرنەگرتووە. وتی بەڵام من هیچ لە خۆمدا شک نابەم و بیرم نایەت شتێکی نادروستم بەرامبەری کردبێت، وتم ئەویش حەز بەو کەسانە ناکات کە چاکەیان لەگەڵدا کردووە، یان هەر خراپەیان بۆ نەبووە، وتی ئەمەیش نەخۆشییەکی ترە.

شێرکۆ لە هەڵوێستی سیاسیدا نوێنەریی ڕاستەقینەی ویژدانی خۆی بووە و ئەگەر بە لایەکی سیاسیشدا بۆ ماوەیەک کەمێک لار بووبێتەوە، زوو فریای خۆی کەوتووە و ڕاست بۆتەوە. چونکە زانیویەتی شیعر و سیاسەت دوو هێڵی تەریبن و پێک ناگەن. سیاسەت دەکرێت بە شیعر، بەڵام نەک لە ڕوانگەی سیاسییەکەوە کە ناتوانێت لە زمانی شیعر و لە فەنتازیای شیعر و لە ڕاستگۆیی شاعیر بگات. ئەو فۆڕمەڵەی هەقیقەتێکی بۆ خۆی کردووە ناتوانێت لێی لابدات، ڕەنگە بێجگە لەوە بە هیچیتر قایل نەبێت. بەڵام بەردەوام ئەو هەقیقەتانە لای شاعیر جێگای پرسیار و گومانن. جێی ڕەخنە لێ گرتن و ڕەت کردنەوەن. بۆیە شێرکۆ تەنانەت لەو کاتانەیشدا کە لە پارتێکی سیاسییەوە نزیک بووە، هەر دەنگی شاعیرانەی خۆی پاراستووە و بەرگری لە بۆچوونی تایبەتی خۆی کردووە، ماڵیی نەبووە و بەڕووی هەر کاریکی نادروست کە دژی بەرژەوەندی گشتی بووبێت چووەتەوە. ڕەنگە هەندێک هەڵوێستی شێرکۆ لەو لایانانەوە توند و چاوەڕوان نەکراو بووبێتن. یان پێشبینی ئەوەی لێکرابێت کە بەرئەنجامێکی زیانبەخشی بەرانبەر بە خودی خۆی لێبکەوێتەوە. بەڵام ئەو دەربەست نەبووە و خۆی لە قەناعەت و ویژدانی ڕەزامەندانەی خەڵک و جەماوەردا بینیوەتەوە. هەر ئەمەیشە وای لە شێرکۆ کردووە کە شاعیری گەورەی نەتەوەکەی بێت بە هەموو پێکهاتە جیاوازەکانیەوە. ئەو کاتێک لەناو یادەوەری کوردا کاردەکات پێویستی بەوەیە هەموو ڕەهەندە جیاوازەکان ئەزموون بکات لە هەڵکەندندا قوڵایی تازە بدۆزێتەوە. شێرکۆ دژی بێدەنگی بوو. لە هەر جێگایەک غەدری بدیایە لەوێ بوو، من لێرەدا وەک هاوڕێیەکی هەرە نزیکی شێرکۆ بێکەس کە ماوەی نزیکەی چل ساڵمان پێکەوە گوزەراندووە و، تەنانەت لەو کاتانەیشدا کە لە هەندەران بووە و لە ژێر سایەی ڕژێمە هەرە تاریکەکەی بەغدا بە ڕێگای جیاواز دەنگمان بەیەکتر گەیشتووە. دەڵێم شێرکۆ وەک مرۆڤێک هەرگیز ڕقێکی ئەستور و درێژ خایەنی لە کەس نەبووە. گەلێک لەوانەی دەناسی کە خۆشیان ناوێت و دژایەتی دەکەن، ئیتر لەبەر ئیرەیی پێبردن بێت بە توانا گەورەکەی کە سەدان لاپەڕەی ناوازەی بە گەلەکەی بەخشیوە و تا بێت زیاتر بەرەو لووتکەی داهێنان دەچێت. یان لەبەر هەر هۆیەکی دی کە زۆرجار پاساویی سیاسی لە دواوەبوو. بەڵام ئەو نەباسی دەکردن و نە ڕقی لێ هەڵدەگرتن. تەنانەت ئەگەر دەربارەی ئەو کەسانە پرسیارێک یان ڕاوێژێکی پێ بکرایە زۆر بە ویژدانەوە ڕای خۆی لەسەر دەدان. شەریعەتی شێرکۆ بێکەس لە ویژدانێکی پڕ لە لێبوردن و خۆشەویستی و سۆزێکی مرۆڤ دۆستانەوە یاسای خۆی دەچەسپاند نەک لە بەرژەوەندی تایبەتی و دەرفەتهێنانی بێ بنەما و ئاکارێکی پووکەشانەوە. بۆیە تا مێژووی ئەدەب و شیعری کوردی مابێت دەبێت شانازی بە کارەکانی شێرکۆوە بکات. تا خۆری بیر و ئاوەزی هێژا و چەلەنگەکانیش ئەم دەڤەرە ڕووناک بکاتەوە شێرکۆ لە لوتکەی درەوشانەوەدایە.

# بیبلیۆگرافیای (شێرکۆ بێکەس)
# لە ناوەرۆکی کتێبی کوردیدا ١٩٧٠- ٢٠١٠



بوار نورەدین

هەرچەند (بیبلیۆگرافیایەکی تایبەت بە (شێرکۆ بێکەس)مان بە ناوی (شێرکۆ بێکەس: بیبلیۆگرافیا، پێرستی لە کتێبی کوردیدا) ئامادە کرد، بەڵام پێویست بوو هەروەك ژمارەکانی پێشتری (ڕۆڤار) لەسەر ئەم پرۆژەیە بەردەوام بین، بەتایبەت ئەم تەوەری بیبلیۆگرافیایە.

پێویستە لێرەدا ئەمانە بنووسینەوە:

ئەو بیبلیۆگرافیایەی چەند ساڵێکە کاری لەسەر دەکەین تەنها لەبارەی (کتێبی کوردی)یەوەیە –لە سەرەتاوە تاکو ساڵی ٢٠١٠–، هەروەها گۆڤار و ڕۆژنامەی نەگرتووەتەوە، تەنها ئەوانەی گرتووەتەوە کە وەك (کتێب) دووبارە چاپ کراونەتەوە. لە هەمانکاتدا، کتێبی بە زمانەکانی: عەرەبی، فارسی، تورکی، ئینگلیزی... نەگرتووەتەوە.

لە دەستنووسی (بەرگی سێیەم)دا کە تایبەتە بە (ئەدەب "تیۆر– ڕەخنە– لێکۆڵینەوە– وتار")ـە و زۆرتر لە ١٠٠٠ کتێبی لەخۆگرتووە... چەند سەرنج و تێبینییەکمان نووسیوە، کە پێویستە تەنها ئەم سەرنجەیان لێرەدا بنووسین: لە ئامادەکردنی بەرگی ناوبراودا، (دیوان)ی شاعیرانی نەگرتووەتەوە، هەروەها ئەو کتێبانەشی نەگرتووەتەوە کە تەنها بەرهەمی شاعیرانیان کۆکردووەتەوە، بێگومان لەبەرئەمەیە کە لێکۆڵەران لە دۆزینەوەی دیوانی شاعیراندا دانامێنن...

لە بەرگی یەکەمدا، دەیان سەرنج و تێبینی و ڕوونکردنەوەمان نووسیوە، کە خوێنەر دەتوانێ بۆ هەر سەرنج و تێبینییەکی دیکە، لەبارەی کتێبی کوردی و جۆری بیبلیۆگرافیا کوردییەکان و ناساندنی سەرچاوەکانەوە... بۆ ئەم کتێبە بگەڕێتەوە: بیبلیۆگرافیای ناسێنراو و پۆلێنکراوی کتێبی تایبەت بە کورد و کوردستان: ١٩٢٥– ٢٠١٠ «بەرگی یەکەم: مێژوو»، ئامادەکردن: بوار نورەدین، چاپی یەکەم– چاپخانەی «سەردەم» سلێمانی– کوردستان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠١٢.

**باخچەی شاعیران- بەسەرهات و هەلبەستی ٤١ بویژی کورد**

کۆکردنەوە و لەسەر نووسینی: عەبدولعەزیم ماوەتی– عەبدولقادر سالح

چاپ: یەکەم، چ(ژین)، ش: سلێمانی، ژس: ؟، س: ١٩٧٠.

ناونیشانی بابەت: شێرکۆ بێکەس.

**نێرگز- کۆمەڵە بەرهەمێکی ڕۆشنبیری و ئەدەبییە/ چەپکی دووەم**

نووسین: چەند نووسەرێك

بە یارمەتی عەلی بۆسکانی چاپ کراوە

چاپ: یەکەم، چ(الحوادث)، بەغدا، ژس: ٥٢٧، س: ١٩٨٥.

ناونیشانی بابەت: شێرکۆ بێکەس و درامای شیعریی.

**سەبارەت شیعری هاوچەرخی کوردی و چەند مەسەلەیەکی ئەدەبیی دیکە**

نووسین: حەمەسەعید حەسەن

چاپ: یەکەم، چ(ئاپێك)، ش: ستۆکهۆڵم– سوید، ژس: ؟[1]، س: ١٩٩٢.

ناونیشانی بابەت: شیعری هاوچەرخی کوردی بە زمانی سویدی/ شێرکۆ بێکەس.

**بەرپرسانی حکومەتی هەرێمی کوردستان- لە چەند چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەگەریدا**

ئامادەکردن: مەگدید سەپان

چاپ: یەکەم، چ(؟)، ش: ستۆکهۆڵم– سوید، ژس: ؟[2]، س: ١٩٩٤.

یەکێك لە چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ (شێرکۆ بێکەس)دا کراوە.

**پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن- دیوی ناوەوەی ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩- ١٩٨٣**

نووسین: نەوشیروان مستەفا ئەمین

چاپ: یەکەم، چ(فۆستفاچ)، ش: ئەڵمانیا، ژس: ؟، س: ١٩٩٧.

---

**١ – ژمارە سپاردنی نییە و ISBN: 91-630-1155-7 هەیە.**

**٢ – ژمارە سپاردنی نییە و ISBN: 91-630-2779-8 هەیە.**

ناونیشانی بابەت: ساڵی ١٩٨٢: شێرکۆ و چلووره فرۆشەکان/ ساڵی ١٩٨٣: شێرکۆ بێکەس.

**پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن- دیوی ناوەوەی ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩- ١٩٨٣**

نووسین: نەوشیروان مستەفا ئەمین

چاپ: سێیەم٣، چ(؟)، ش: سلێمانی، ژس: ؟، س: ١٩٩٨.

هەمان بابەتی کتێبی پێش خۆی...

**تاپۆ و بوومە لێڵ**

نووسین: سوارە ئێلخانی زادە

لە بڵاوکراوەکانی نشری پانیز- ئێران

چاپ: یەکەم، چ(ساڵحان)، ش: ئێران، ژس: ؟٤، س: ١٣٧٩ (٢٠٠٠).

ناونیشانی بابەت: شێرکۆ بێکەس و گرِوگاڵ دوای گۆران.

**گەڕان بە دوای ناسنامەدا**

نووسەر: عەتا قەرەداخی

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ(سەردەم)، ش: سلێمانی، ژس: ٤٥٣، س: ٢٠٠٠.

ناونیشانی بابەت: ئەفسانەی گەڕانەوە لە (ناو قەفەزێکەوە)ی شێرکۆ بێکەس.

**ئەلف تێکست/ ڕەخنە- خوێندنەوەی کۆمەڵێ تێکست.. لە ئاسۆی جیاوازەوە**

نووسین: محەممەد نوری ئەحمەد

لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ

چاپ: یەکەم، چ(دانان)، ش: سلێمانی، ژس: ١، س: ٢٠٠٢.

ناونیشانی بابەت: دوو خوێندنەوە بۆ دونیای شیعریی (شێرکۆ بێکەس).

**گەڕان بە دوای بووندا- یۆتۆپیای ئازادی**

نووسین: عەتا قەرەداغی

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ(سەردەم)، ش: سلێمانی، ژس: ٣٨٢، س: ٢٠٠٢.

ناونیشانی بابەت: ڕەهەندی گۆڕان لە شیعری (ماك)ی شێرکۆ بێکەسدا.

**خەیاڵ و ڕۆح- چەند تێڕوانینێك بۆ شیعری کوردی**

نووسین: (ناوی ١٧ نووسەر لەسەر بەرگ نووسراوە)

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ(سەردەم)، ش: سلێمانی، ژس: ٦٠٢، س: ٢٠٠٤.

ناونیشانی بابەت: ڕەهەندی گۆڕان لە شیعری (ماك)ی شێرکۆ بێکەسدا: عەتا قەرەداخی/ تێڕوانینی شێرکۆ بێکەس بۆ (ژن و کۆمەڵگە): مەهاباد قەرەداغی/ تێڕوانینێکی شێوەکارییانە بۆ (ڕەنگدان): قادر میرخان/ پاکژبوونەوە لە ڕەنگدا: ڕێبوار سیوەیلی/ ڕەنگدان و پێکهاتەی ڕەنگ و ئاستی شیعریەت لە پانتایی قەسیدەکەدا: ئاوات محەممەد/ چاوخشاندنێك بەسەر وەرزی سەهۆڵبەنداندا: ئومێد بێناز/ چەند بابەتێکی تر...

**٣ - تاکو ئێستا (چاپی دووەم)مان دەست نەکەوتووە.**

**٤ - ژمارە سپاردنی نییە و** ISBN: 964-90549-0-1 **هەیە.**

شێرکۆ بێکەس



**ئەفسانە لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا**
نووسین: کەریم شارەزا
لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەری هەولێر- وەزارەتی ڕۆشنبیری
چاپ: یەکەم، چ(و- ڕۆشنبیری)، ش: هەولێر، ژس: ٣٥٠، س: ٢٠٠٥.
ناونیشانی بابەت: ئەفسانە لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا/ شێرکۆ بێکەس.

**ڕۆژانی سەخت- بەرگی دووەم**
نووسین: د. ئەرسەلان بایز ئیسماعیل
لە بڵاوکراوەکانی مەکتەب ڕێکخستن- بەشی ڕووناکبیری (ی.ن.ک)
چاپ: یەکەم، چ(روون)، ش: سلێمانی، ژس: ١٨٧، س: ٢٠٠٥.
ناونیشانی بابەت: کۆڕەکانی کاک شێرکۆ بێکەس.

**گەڕان بەدوای شیعر و جیاوازیدا- لێکۆڵینەوە**
نووسین: محەممەد کوردۆ
لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی- وەزارەتی ڕۆشنبیری
چاپ: ؟، چ (؟)، ش: ؟، ژس: ١٠٣٥، س: ٢٠٠٦.
ناونیشانی بابەت: گەڕان بە دوای شیعردا- گەشتێك بۆ دنیا تایبەتەکەی شێرکۆ بێکەس.

**ڕۆمانێك لە گفتوگۆدا- گفتوگۆ و بیروڕای نووسەران دەربارەی شاری مۆسیقارە سپییەکان**
ئامادەکردن: ئەنوەر حسین
لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی- وەزارەتی ڕۆشنبیری
چاپ: یەکەم، چ(؟)، ش: سلێمانی، ژس: ٧٧٥، س: ٢٠٠٦.
یەکێك لە گفتوگۆکان لەگەڵ (شێرکۆ بێکەس)دا کراوە.

**یاقووت و زمرووتی کوردیی (سروشت و جوانیی)- بەرگی سێیەم**
نووسین: حسێن محەممەد عەزیز
چاپ: یەکەم، چ(سیما)، ش: سلێمانی، ژس: ٤٣٣، س: ٢٠٠٧.
ناونیشانی بابەت: زستان- لە هۆنراوەی چەند شاعیرێکدا: شێرکۆ بێکەس/ پاییز- لە هۆنراوەی چەند شاعیرێکدا: شێرکۆ بێکەس.

**ڕەخنەی نوێی کوردی**
نووسین: د. کەمال مەعروف
لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی- وەزارەتی ڕۆشنبیری
چاپ: ؟، چ(و- ڕۆشنبیری)، ش: سلێمانی، ژس: ٢٩٥، س: ٢٠٠٧.
ناونیشانی بابەت: ڕەمز لە شیعرەکانی شێرکۆ بێکەسی شاعیردا.

**مەنفا و خوێندنەوە- چەند گفتوگۆیەکی ئەدەبیی**
نووسین: توانا ئەمین
لە بڵاوکراوەکانی پاشکۆی ڕەخنەی چاودێر
چاپ: یەکەم، چ(؟)، ش: سلێمانی، ژس: ٢١٧٥، س: ٢٠٠٨.
ناونیشانی بابەت: تەوەری دووەم: نووسین و خوێندنەوە/ شێرکۆ بێکەس.

**چەند ستێرێن گەش د ئەسمانێ هەلبەستا نوویا کوردی دە- کرمانجیا ژێری**

نووسین: خەلیل دهۆکی

ژ وەشانێن ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد– دهۆك

چاپ: یەکەم، چ(هاوار)، ش: دهۆك، ژس: ٣٨٤، س: ٢٠٠٨.

ناونیشانی بابەت: شێرکۆ بێکەس ب چاڤێ ئەلهۆیەکی ل بوویەرێن گەلێ خوە دنێرە.

**شیعریەت لە دەرەوەی شیعر**

نووسین: زاهیر ڕۆژبەیانی

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ(ئاراس)، ش: هەولێر، ژس: ١٥٠٢، س: ٢٠٠٨.

ناونیشانی بابەت: شێرکۆ بێکەس و ونبوون لە نێوان داستان و درامای شیعریدا.

**مێژووی وێژەی کوردی- بەرگی سێیەم**

نووسین: سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ(ئاراس)، ش: هەولێر، ژس: ٩٤٣، س: ٢٠٠٨.

ناونیشانی بابەت: هۆنراوەی نوێ/ شێرکۆ بێکەس.

**ڕەخنەی بونیادگەری لە تیۆرەوە بۆ پراکتیزەکردن (ڕەخنەی شیعری کوردی بە نموونەوە)**

نووسین: د. عەلی تاهیر حسین

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ(سەردەم)، ش: سلێمانی، ژس: ٤١، س: ٢٠٠٨.

ناونیشانی بابەت: بەشی چوارەم: بونیادگەری لە بواری پراکتیکدا/ بونیادگەری و گوتاری ڕەخنەی کوردی/ کارکردن لەسەر چەند دەقێکی شیعری کوردی بەپێی میتۆدی بونیادگەری/ (دەقی ئازادی)ی شێرکۆ بێکەس.



**جوانی و جیاوازی- ڕەخنەی ئەدەبی**

نووسین: محەممەد کوردۆ

لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی– وەزارەتی ڕۆشنبیری

چاپ: ؟، چ(بینایی)، ش: سلێمانی، ژس: ١٨٢٠، س: ٢٠٠٩.

هەمان بابەتی کتێبی ژمارە ١٤ (بە دەستکارییەوە).



**گەڕان بەدوای شیعر و شیعرییەتدا- لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی**

نووسین: عەتا قەرەداغی

لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی– وەزارەتی ڕۆشنبیری

چاپ: یەکەم، چ(شڤان)، ش: سلێمانی، ژس: ١١٦١، س: ٢٠٠٩.

ناونیشانی بابەت: من و ئێوە لە شیعری (وەڵام)ی شێرکۆ بێکەسدا.

**خوێندنەوەی چەند دەقێکی ئەدەبی و فیکری**

نووسین: سامان محەممەد

لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورد– لقی کەرکووك

چاپ: یەکەم، چ(کارۆ)، ش: سلێمانی، ژس: ؟، س: ٢٠١٠.

ناونیشانی بابەت: لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری– ڕەنگدانەوەی نامۆبوون لە نێوان شێرکۆ بێکەس و مەحموود دەروێشدا.

# ئێستا
# ژیان نیشتمانمە



**بەختیار عەلی**

نۆرمان میللەر لە تێکستێکیدا دەڵێت « مردن زۆر سەخت نییە، تا ئێستا کەس نییە نەیتوانیبێت بمرێت». بەڵام ئەم وەسفە بۆ هەموو کەس دروست نییە... بەبڕوای من شێرکۆ لەوانەیە چەندە بیەوێت، چەندە هەوڵبدات ناتوانێت بمرێت. کورتکردنەوە و وەسفکردنی شێرکۆ لەکارە سەختەکانە، من ڕستەیەک شکنابەم لە وەسفیدا باسیبکەم، دێڕێکی کنۆت هامبسون نەبێت کە دەڵێت «بلیمەت چەخماخەیەکە، گرمەکەی سەدان ساڵ دەنگدەداتەوە». ڕاستە ئەمڕۆ چیتر ڕووناکی ئەو چەخماخەیە نابینین، بەڵام بەدڵنیاییەوە گرمەی تا سەدان ساڵی تر و ڕەنگە تا دوا کورد لەسەر ئەم ئەستێرەیە بەردەوام بێت. مردنی کتوپڕ نەبوو، لەو جێگایەدا هات کە دەبوو بێت، وەک خۆی، وەک ڕووداوێک، وەک شتێک دوای خۆی ڕەنگی دونیا دەگۆڕێت... مردنی وەک شتێک دێت کە پێشتر زۆر بیری لێکرابێتەوە، وەک پلانی بۆ کێشرابێت، وەک ساتێک بێت، لەمێژە خۆی بزانێت لەکوێدایە و کەی دێت. مردن هەمیشە بەشێکی گرنگی جیهانبینی شێرکۆ بووە، بەڵام شێرکۆ لەو شاعیرانەیە کە دەتوانین بە شاعیرانی ژیان ناویان بەرین. زۆر لەسەر مردووەکانی نووسیوە، نا بۆ ئەوەی مردنیان بگێڕێتەوە،



بەڵکو بۆ ئـەوەی زیندوویانبکاتەوە... نووسین لای شێرکۆ، پرۆسەی ژیان بەبەرداکردن بووە. نووسین لای ئەو بەدروستکردنی ژیانەوە گرێدراوە. سەردەمی شێرکۆ، بەمرۆشەوە سەردەمی مردن و کارەساتە گەورەکان بوو. بەرامبەر بەدەسەڵاتی ڕەهـای مـەرگ، شیعری شێرکۆ سەمبولی دەسەڵاتی ڕەهای ژیانە. ئەو بە ژیانی ڕەها، بە ژیانێک کە دەکرێت بەبەری هەموو مردووەکاندا، بەبەری هەموو بێگیانەکاندا، وەڵامی مەرگ دەداتەوە، بەرامبەر بەبێنرخبوونی مـرۆڤ، شیعری شێرکۆ گۆرانییەکی بەردەوام و ستایشکردنێکی بێوچانی جوانییەکانی مرۆڤە. هەموو شتێک لە شیعری شێرکۆدا دەژی و وەک مرۆڤ دەنوێنێت. نیشتمانی شێرکۆ، نیشتمان نییە بەمانا ناسیونالیستییە تەسکەکەی، بەڵکو هەموو ئەو شوێن و سنوورانەیە کە هێزی ژیان دەستی دەگاتێ. لە شیعری ئەودا بەردەکان، چیاکان، باڵندەکان، پێکڕا وەک ئێمە زیندوون، وەک ئێمە هاوار دەکەن، دەترسن و دەژین و بۆ مانا دەگەڕێن . «گۆران»یش وەک شێرکۆ عاشقی ژیان بوو، بەڵام گۆران کوڕی ڕۆژگاری کارەساتە گەورەکان نەبوو... گرنگیی شێرکۆ لەوەدایە لە ناوەڕاستی هەموو گەردەلوول و کارەساتەکاندا ستایشی ژیان دەکات، ئەو تەنیا وابەستەی زیندوویێتی خۆی نییە، بەڵکو وابەستەی لادان و شکاندنی هەر قاڵبێکە کە بوونمان گەمارۆ دەدات، شیعری ئەو هیچ نییە جگە لەبەربوونی وزەی ناکۆتای ژیان لە زیندانە گەورەکانی خۆی، شێرکۆ لە سیاسەتیشدا نوێنەری هـاواری ژیانە، نـەوەک هاواری ئایدۆلۆژیایەک، یان بەرەیەک. ئەو شاعیری ڕووداوە گەورەکان و شتە بچووکەکانیش بوو، هیچ کات لە زمانی شیعر بەولاوە زمانێکی تری نەبوو، شیعری ئەو بریتییە لە سەفەرێکی بێوچان و قووڵ و پڕ لەسەرسامی بەناو شتەکان و پەیوەندییە نهێنییەکانیاندا، یەکێک بوو لەو شاعیرە کەمانەی مێژوو کە دەتوانن هەموو شتێک بکەن بە شیعر... لەهەر شت سەختتر و گرنگتر بۆ من، هێزی شێرکۆ بوو لەسەر گۆڕینی سیاسەت بۆ شیعر. سیاسەت لای شێرکۆ بەشێک بوو لە دونیابینییە شیعرییەکەی، هیچ کات بەچاوی سیاسی سەیری شیعری نەدەکرد، بەڵکو هەمیشە بەچاوی شاعیر سەیری سیاسەتی دەکرد... هیچ کات هەستم نەکردووە، لەوە بپرسێت خەڵک لەسەر خۆی، لەسەر هەڵوێستی، لەسەر بڕواکانی چی دەڵێن، بـەڵام هەمیشە دوودڵـی ئەوەبوو لەسەر شیعری چی دەگووترێت. نە پێش ئەو و نە دوای ئەو، کەسێکمان نییە بەوجۆرە دیلی شیعر بووبێت. شێرکۆ شاعیر نەبوو، بەڵکو کارخانەیەکی گـەورە و سەرسوڕهێنەری شیعر بوو. هێزێکی بێوێنەی هەبوو، شیعر لە هەموو فۆرم و شێوە و ئەگەرەکانیدا تاقیبکاتەوە، شیعر تا ئەوپەڕی سنوورەکانی مەحاڵ ڕابکێشێت، هەمان بیرۆکە و هەمان ئایدیا لە سەدان وێنەی جیاوازدا دابڕێژێت. ئەو هەمیشە لێرەیە... لەو مرۆڤانەیە کە تەنیا لەدایکدەبێت، مردنی هیچ نییە جگە لە میتافۆرێکی شیعری، لە مەجازێک کە هیچ کات ناتوانین وەک حەقیقەت وەریبگرین... لەگەڵ شێرکۆدا مردن هیچ کات ناتوانێت وەزیفەی تەواوەتی خۆی تەواو بکات، ئەو وەک هەموو نووسەرە گەورەکان یەک لەشی نییە، بەڵکو زیاد لە لەشێکی هەیە، مردن تەنیا دەتوانێت فۆرمێکی جەستەی بسڕێتەوە، بەڵام فۆرمەکانی تری هەمیشە لێرەن ... ئەو لەو ڕۆحانەیە چەندە مردن لە ڕاڕەوەکانی کات و شوێندا دوای بکەوێت، بەجۆرێک لەجۆرەکان زیندوو دەبێتەوە و سەرهەڵدەداتەوە، ئەو وەک هەموو شاعیرەکان پتر لە سەرابە تا لە گۆشت. ئەوەی شێرکۆی کرد بەکاراکتەرێکی گەورە، ئەو توانا گەورەیەی بوو، هەمیشە لەسەرەتاوە دەستپێبکاتەوە، شیعر لای شێرکۆ ئەزموونێک نییە سەرەتا و کۆتایی هەبێت، بەڵکو هەر خودی ژیانە لەجووڵە ئەبەدییەکەیدا. ڕەنگە هەموو سەرسامبووبین بەتوانای لەسەر نەوەستان، لەسەر نووسین، بەڵام خۆی نا، خۆی یەکێکە لەوانەی هەمیشە لەسەرەتاوە دەستپێدەکەنەوە، بۆ ئەو ژیان ئەوەبوو بنووسێت، نـەوەک هەناسە بـدات. ئەو لەو مردووانەیە کە بەردەوام دەگەڕێنەوە، هەمیشە شتێکی نوێی تێدایە دەبێت بانگیبکەین و بیبینین. ئەو تەنیا مرۆڤێک نەبوو بەهەزاران قەسیدەوە، بەڵکو مرۆڤێکە سەردەمەکانی داهاتوو، ئەو ڕۆژگارانەی کە دێن، هەرگیز تێرنابن لەسەیرکردنی.

زۆر ناڕۆم گەر بڵێم شێرکۆ تەنیا ڕوانگەییەکی ڕاستەقینە بـوو، تاکە ڕوانگەییەک تا کۆتا بەوەفا بوو بۆ ئەو گیانی داهێنانەی ڕوانگە بانگەشەی بۆ دەکـرد، تاکە ڕوانگەییەکیش کە ڕوانگە دیلی نەکرد. لەساتێکدا ناوی ئەو تەواو بەسەر ناوی ڕوانگەدا سەرکەوت، هێزی ڕوانین و بینینی لەوە گەورەتر بوو لەهیچ ڕێباز، یان قاڵبێک، یاخود فۆرمێکدا ببەسترێتەوە. وەک هەموو نووسەرێکی گەورە توانای هەبوو سەر بەهیچ ڕێباز و قوتابخانەیەک نەبێت، ڕوانگە لە ئەزموونی سەرەتایی شێرکۆدا، ساتێکی ترازانە لە مێژووی پێش خۆی... ساتێکی هەستکردنە

بەلەدایکبوونی دونیایەک کە پێویستی بەدەنگێک هەیە ببێتە نوێنەر و قسەکەری، بەهەڵگری پارادۆکس و ناکۆکییەکانی، بەگوزارشتکەرێک لە ئومێدە ترساوەکانی.
بەبڕوای من ڕوانگە هیچ کات قوتابخانە، یان ڕێباز نەبووە، بەڵکو ناونانێکی میتۆلۆگییە بۆ لەدایکبوونی دونیایەکی نوێ، بۆ ساتێک هەست بەئاوابوونی جیهانێک دەکەین و خۆمان لەبەردەم گەرداوی ڕۆژگارێکی نوێدا دەبینین.
جیاوازی نێوان شێرکۆ و هەموو شیعری پێش خۆی بە پلەی یەکەم لەوەدایە، کە شاعیرانی دی هەموو بەجۆرێک لەجۆرەکان لەناو جیهانێکی ئامادەدا لەدایکدەبوون، لەناو سیستمێکی زمان و وێناکردنی پێشوەخت ئەزموونکراودا، لەناو فۆرمێکی شیعر و شێوەیەکی تێڕوانیندا کە مێژوویەکی دێرینەی بوو، ئەفسانەی شێرکۆ لەوەوە دەستپێدەکات کە دوای دوو دیوانی یەکەمی بەجۆرێکی ڕادیکال، لەناکاو، وەک بازێکی ئەفسانەیی شیعرەکانی «من تێنوێتیم بەگڕ دەشکێ» دەنووسێت، باز بەرەو جیهانێکی نوێ و زمانێکی نوێ دەدات کە پێشتر نەبووە و تاقینەکراوەتەوە. «من تینوێتیم بە گڕ دەشکێ» لەگەڵ «لەخەوما»ی جەمیل سائیب، دوو گرنگترین کاری ئەدەبی سەدەی بیستی ئێمەن... لەبەرئەوەی لە هەردووکیاندا بەجۆرێکی ڕادیکال شکاندنی گۆشەنیگا و سیستمی وێناکردنی دونیا هەیە. «من تینوێتیم بەگڕ دەشکێ» ساتی لەدایکبوونی ڕاستەقینەی شێرکۆیە، ساتی جیابوونەوەی گەورەیەتی لە گۆران، ساتی پچڕانی



**شێرکۆ بێکەس / هێڵکاری - هونەرمەند ئاکۆ غەریب**

شیعری کوردییە لەچەند سەدەیەک ڕابردووی خۆی... بەبڕوای من هەڵەیەکی گەورەیە دروستبوونی ئەم ساتە تەنیا بگێڕینەوە بۆ کاریگەریی شیعری عەرەبی نوێ لەسەر نووسەرانی ئەو دەم، بەپێچەوانەوە، ئەو ساتە ساتی پەیوەندی ڕاستەقینەی ئەدەبیاتی ئێمەیە بەکەلەپوورێکی کۆن و دێرین و چەپێنراوی خۆی، ساتی لەدایکبوونی ڕاستەقینەی زمانە بەمانا هەرە گەورە و بێسنوور و فەنتازییەکەی ... شێرکۆ ساتی هاتنەگۆی زمانێکە بەدرێژایی مێژوو بەچاوی بەستراوەوە قسەیکردووە. ساتی پەیوەندیکردنی زمانە بە قووڵاییە شاردراوەکانی خۆیەوە، ساتی دۆزینـەوەی زمانە بۆ ئازادی خۆی، ئازادییەک کە حەتمەن پێش هەموو جۆرە ئازادییەکی تر دەکەوێت. ئەمجۆرە شۆڕشە تەنیا لە قووڵایی زمان خۆیدا دەکرێت، کاریگەرییەکانی دەرەوە هەرچییەک و هەرچۆنێک بن، تەنیا مۆتیڤن و هیچی تر ... نوێگەریی شێرکۆ ناشوبهێنرێت بەهیچ جۆرێک لە نوێگەرییەکانی تر لە ئەدەبیاتی دەوروبەردا، شێرکۆ تەنیا داهێنەری فۆرمێکی نوێی شیعر نییە، بەڵکو ساتێکی گەورەتر و ئەفسانەییترە، ساتی دۆزینەوەی زمانە بۆ جەستەی خۆی، بۆ ناکۆتابوونی خۆی، بۆ سنووره دوور و ئەگەرە بێشومارەکانی ناوی... لەگەڵ شێرکۆدا زمانی کوردی لە زمانێکەوە کە تەنیا لە مەودای تەسکدا بەکاردەهێنرێت، تەنیا لەسەر لۆکاڵ ئیشدەکات، لەبۆ گەیاندن دەجوڵێتەوە، دەبێتە زمانێکی یۆنفێرسال، زمانێک بۆ هەموو شتێک، بۆ هەموو سەرکێشییەک، بۆ هەموو جۆرە گوزارشتێک، واتە توانای گوزارشتی لە ئەبستراکت دەگاتە هەمان توانای بۆ گوزارشت لە دونیای واقیعی و مەتریالی، سیفەتێک ڕێگا بەوەچەکانی دوای شێرکۆ دەدات، دەرگای بیرکردنەوەی تیوریی لە زمانی کوردیدا بکەنەوە، کارێک کە بێ ئەزموونی شێرکۆ نەکردە و ئەستەم بوو. ڕۆڵی مارتن لۆتەر لە ئازادکردنی زمانە ئەورووپییەکاندا لە چنگی لاتینی چەند گەورەیە، ڕۆڵی شێرکۆ لە ڕزگارکردنی زمانی کوردیدا لە مێژووی خنکاوی خۆی، لە دەسەڵاتی زمانەکانی دەوروبەر هێندە گەورەیە.
شیعری شێرکۆ و ئەزموونە هەرە گەورە و نەبڕاوەکەی، ئـەو هەوڵە داستانئامێزە بۆ باوەشکردن بەهەموو گەردوندا لە ڕێگای شیعرەوە، بۆ نزیکبوونەوە لەهەموو شتێک لە ڕێگای شیعرەوە، بۆ گۆڕینی شیعر بۆ خاڵێک دونیا لێوەی دەست پێدەکات، گوزارشتە لەو لەرینەوە گەورە و شەپۆلانە مەزنەی زمان دەتوانێت وەک دەریا لەناو خۆیدا دروستیبکات. گەر زۆر وردبینەوە دەبینین کە ئەوە شێرکۆ نییە زمان بەکاردەهێنێت تا قسە بکات، بەڵکو زمانە شێرکۆ بەکاردەهێنێت تا گوزارشت لە گەورەیی و بێسنووریی خۆی بکات... ئەوە شێرکۆ نییە لە ڕێگای زمانەوە خۆی ئازاد دەکات، بەڵکو زمانە لە ڕێگای شێرکۆوە ئازاد دەبێت.
شیعری شێرکۆ وەڵامێکی گەورەیە بۆ چەندین سەدە لە بێدەنگی قووڵ و گەورە. ئەو بەهەزاران لاپەڕە لە شیعر، وەڵامی سەدان ساڵ لە بێدەنگی ئێمە دەداتەوە. شێرکۆ دێت و یەکەم ئـاوڕدانـەوەی لـەدوای خۆی، مێژوویەکی لاواز و خاڵی دەبینێت، دنیایەک شتەکان تێیدا بێدەنگن... لە شیعری کلاسیکیدا جگە لە سۆز و عاتیفەی عاشقانە هیچی تر قسەی نەکردووە، عاتیفەی چەپێنراوی مرۆڤ بەجۆرێک بەسەر فەنتازیای شیعردا زاڵبووە، تەواوی دونیا و هەستەکان و شتەکانی تری بێدەنگ کـردووە. شیعری شێرکۆ وەڵامێکی گەورەیە بۆ ئەو بیابانە مێژووییە بەرینە... ڕزگارکردنی شیعرە لەوەی تەنیا گوزارشتێکی عاتیفییانە بێت بۆ وەسفی یار و گلەیی بێت لە دووری ئەو. شێرکۆ دووری نێوان «وشەکان»و «شتەکان»بەجۆرێکی قووڵ دەدۆزێتەوە، ئەو فاسیلە گەورەیە هەست پێدەکات کە لەنێوان شیعر و بووندا دروستبووە. شیعری شێرکۆ لەبری گوزارشتێکی عاتیفیانەی کلاسیکی، دەبێتە نزیکبوونەوەیەکی گەورە لە گەردون. هەموو ئەو ڕووبەرانەی لە ئەزموونی کلاسیکیدا بێدەنگ و شـاردراوەن لە شیعری شێرکۆدا شوێنی خۆیان وەردەگرنەوە، شیعری شێرکۆ هاتنەگۆیەکی نوێی وشەکان و دەرکەوتەی ڕووخسارێکی دیکەی شتەکانە، هەم چالاکبوونەوەی وشەیە، هەم ڕزگاربوونی شتەکانە لە مردن و فەرامۆشی.
لەڕاستیدا شتێک نییە ناوی کۆتایی قسەکردن بێت لەسەر شێرکۆ... لەهەر جێگایەک هەستبکەین شتێکمان لەسەر شێرکۆ گووتووە، هەر لەو جێگایەدا دەبێت دووبـارە بیخوێنینەوە و بەسەر دونیا ئاڵۆز و فرە ڕێ و فرە چینەکەیدا بچینەوە... ئەو بەتەنیا شاعیرێک نییە هاتبێت و بڕوات، سەردەمێک بوو بەهەموو جەنجاڵییەکانییەوە، جیهانێک بوو بەهەموو پارادۆکسە گەورەکانییەوە، جیهانێک لەڕێگای ئەوەوە و تەنیا لەژێر باڵی خودێکی فرە ڕەنگ و فرە باڵی وەک ئەودا، دەیتوانی گوزارشت لە ترس و ئومێد و خەونەکانی خۆی بکات.





هەڵۆ شێرکۆ بێکەس کاتی خوێندنەوەی پەخشانەکەی بۆ باوکی



# شێرکۆنامەیەک بۆ پارکی ئازادی

**هەڵۆ شێرکۆ بێکەس**

ئەمڕۆ هەست و نەستمان شەبەنگێکە مل بە کوێنی شەونماوی و دڵۆپ دڵۆپ حەسرەتی مەیلە و ئاڵی لێ ئەتکێ!
ئەمڕۆ ئەچینەوە نێو تەمە خەمێ، دالآنی هەورێ کە لە تەوقی سەرەوە تا کەڵەموستی پێی ئەم وڵاتە دائەگرێ و دائەپۆشی بە خەمی ئاوابوونی کەڵەشاعیرێ...
خەمێ بە درێژی نەخشەی هەموو کوردستانە، بە پانیی هەموو مێژووی ئەنجن ئەنجنیی جەستەمانە و بە قووڵیش:
قووڵایی هەر هەموو کۆستەکانمانە! تۆ هەموو ڕۆژێ لەناوماندای، وەک چریکەی ئەسغەر و دەنگی مامڵێ.. وەک پەنجەرە و ڕۆژمێر و سەعات و بە هاوینان وەک مانگە شەوێ... تۆ هەموو ساتێ لەگەڵماندای، چوون پەنجەکانمان تۆ بووی بەگوڵی ڕەشی ناو گیانمان و نێو باخچەکانمان...
بووی بە پارکی ئازادی..
لێرە و لەوێ لەناو تیرێژی هەتاودای وەختێ بە ستوونی، یان شاقووڵیی دێیتە ژوورێ!
* تۆ لیمۆیت و بۆنت ئەکەین..
تۆ خەمیت و ڕەنگت ئەکەین..
تۆ عەشقیت و سەیرت ئەکەین...
تۆ دەنگیت و لە بێدەنگیماندا جریوەت ئەکشێ..
چی بڵێ وشەی سەر و قژ ژاکاوم و سەدای کام زایەڵەی سەفەری لێوە دێ... شمشاڵی ئەم کۆستە و وێرانەی هەتاوێک؟ چوویتە پارکی ئازادی و بووی بە گوڵە عەترێ لەوێ... وەختێ جووتە عاشقێ ئەبن بە کزەبایەک و بەلای تۆدا تێئەپەڕێ...
ئیتر وشە و ئیتر ڕستە و ئیتر خەو و بێداریت و تەماشایش وەکو دەنگت، بۆنی خۆشی ڕەنگت ئەگرێ...
کە ڕۆژ ئەیشگاتە ئێوارە، لە پارکی ئازادییەوە ڕووئەکەیتە شاخی گۆیژە و ئەڕوانیت و لەناو گەواڵە هەورێکدا دەنگ و ڕەنگت و دڵۆپ دڵۆپ پێکەنینت ئەبینین و یان لە پەلکەڕەنگینەی کەوانەیی سەر ئەزمردا، کە شانی ڕاست دائەداتە سەر هەڕووتە و دەستی چەپی لە بەرۆکی ناو ڕەزێکدا نوقم ئەکا...
دەست و پەنجە و سەر و قژت و هەردوو چاو و عەینەکەکەت و باڵات لێمانەوە دیارە..
من بە پارکی ئازادی ئەڵێم...
ئەم کەڵەشاعیرەی لە بنتا ڕاکشاوە...
ئەم کۆستە گەورەیەی شیعر رووەکێکی سەیرە بەدڵنیایی کز ئەبێ و بە مەراقیش ئەشنێتەوە... ڕۆژمێری چاوەکانی ئەم شاعیرە، ڕۆژمێری چاوەکانی ئەم کۆی شێرە... ڕۆژمێری ئەشکی خاک و ڕۆژمێری هەڵقرچاوی مێژووی ئاو و سەعاتێکی زەنگ لێدەری بەردەوامی خوێنی ئەم شارەیە... گۆرانییەکی غەمگینی شینبا و بەشوێن شێرکۆدا ئەگەڕێ، ئێوارە و غەریبی لێ ئەچۆڕێتەوە...
چەندین ئەستێرەی بەسەردا ئەکشێ و چەندینجار ئەبێ بە خەون و چەندینجار بە هەور و چەندینجار بە پرسیار و دائەنەوێ و چەندینجاریش بەسەبەتەی گوڵە فرمێسک و گوڵدانی شکاوی هەتاو هەڵئەگرێتەوە...
تۆ ژانێکی پارکی ئازادی گەشاوەیت و
تۆ ئێستاکە گوڵی دووکەڵی چواری هەشتی و
لەبەر پێوە تا تەوقی سەر
بە گۆیژەدا هەڵزناوی....



گۆڕی شێرکۆ بێکەس پێش بەخاکسپاردنی/ پارکی ئازادی



ئەرێ شێرکۆ چۆنی؟

من ڕەئـووف بێگەردم... بۆ ئەم ئێوارەیە لەم کافیتریای سەردەمی غوربەتەدا قاوەیەکم لەگەڵدا ناخۆیتەوە؟ کۆترێکی سپی ماندوو وەکو دڵی "حسێن عـارف" تەڵە چیرۆکێکی سەوزی کردووە بە دەنووکیەوە و لە "مێرگەپانەوە" فڕیوە و هاتووە و ئەیەوێ لە "پارکی ئـازادی"دا لەسەر تابووتێ بنیشێتەوە... ئەمە یەکەمجارە زەردەخەنەی شیعر دەموچاوی نەکا بە گۆمی ئێواران!

یەکەمجارە بێباکانە پاڵکەوێ و بەرزەپێ لەبەر عەشقی سەرگەردانی وڵات هەڵنەسێ! یەکەمجارە قسە نەکات وەختێ ئازادیی ئەدوێ! یەکەمجارە دەست بۆ عەینەکەکەی نەبا و یەکەمجاریشە قەڵەمی پێنەبێ و یەکەمجاریشە جگەرەیەک دانەگیرسێنێ!...

هەتا ئەهات شیعرت بە باڵای جوانیدا هەڵئەکشا!

بە زمانی ڕەوانی ئاو، بە زمانی گژوگیا و بە زمانی بەرد و بە زمانی دەشت و چیا...

ئەرێ برا من فاروقی مەلا مستەفای هاوڕێی منداڵیتم.. بۆ هەڵناسی؟ ئەی شێرکۆی شیعری جوان؟

هاتووم و هەندێ نوکتەی تازە تازەم پێیە تا من بیکەم بە قەڵبەزە و بە تاقگەی پێکەنین و ئاوازی جوان...

لە شارێکی بێ فرمێسکدا لە چەند چاوێ زیاتر نە کەسێکی تر فرمێسکی هەبوو تا بیڕێژێ، نە کەسیش ئەیزانی ئەم کۆی شێری غەریبە بـەرەو کـوێ کـۆچ ئـەکـا!... لەودیو ئۆقیانووسێکی بێ بەزەییەوە وڵاتێک لە شێوەی شاعیرێکدا گیانی ئەدا... وڵاتێک لە شێوەی قەسیدەیەکدا بەلادا هات، هەوایەک هەناسەی لێبڕا...

ئێستاش گوێم لێیە...

زەنگی گەردنی ژوورەکەش لە سەردەم دەست بەخۆیا ئەنێ..

بۆ عوسمانی چایچی بۆ چایەک...

ئاخر ئاراس، هەورامان، شوان لە کوێن، برادەر لە کوێن... ئەو چایەتان هەر نەدایە!.

ئەرێ چاوم.. تۆ لەبەر کەس هەڵنەسای خۆ ئەبێ لەبەر من هەڵسی..

من شیعرم... شیعر.. هاتووم ئەم ڕۆحەت بدەمێ، بۆ هەڵناسی و لێم وەرگری...

من شیعرم، شیعر.. کێ ئەوەندەی من لەگەڵتا بوو، کێ ئەوەندەی من تۆی خۆشویست...

لە داڵانێکی دوور و درێژی سپیدا، پەرستارێکی سپی، بە هێواشی پاڵی بە عەرەبانەیەکی سپییەوە ئەنا، لەسەر پشت مانگێکی شیعری سپیش ڕاکشا بوو، مانگ چاوی نووقا و هەردوو گوڵە هێرۆی دەستیشی لەسەر سنگی دا نابوو....

لەودیو ئۆقیانووسێکی بێباکەوە

لە وڵاتێکی خوێن سـارد و زەمانێکی خوێن سـاردا، لە نەخۆشخانەیەکی چاو گەورە گەورەی بێ ئەسریندا، شێرکۆ مرد و کەوتە خوارەوە بۆ ناو عەدەم و خەیاڵ تاریکی کرد و هەموو شیعری دنیایش بۆی گریا!!....




پارکی ئازادی/ لەچاوەڕوانی بەخاکسپاردنی شێرکۆ بێکەسدا



# گۆڕ وەکو جێگایەك بۆ دووبارە لەدایکبوونەوە

ئاراس فەتاح

"ئەمجارەیان من ناچمەوە لای نامۆیی و (...)
لەگەڵ نالی ئەڕۆمەوە بۆلای گۆیژە و
پیکیشەوە ئەچینەوە لای سالم و
حەبیبەی شار!"

(دەربەندی پەپوولە)

شێرکۆ بێکەس شاری سلێمانی لە هەموو شوێنێکی تری ئەم دونیایە زیاتر خۆشدەویست، بۆیە دەیەوێت لەوێش بنێژرێت. ئەوەی جێگای تێڕامانە ئەو بەتەنها نایەوێت بگەڕێتەوە شار و لەوێشدا لەسەر یەکێک لەگردە کەنارکەوتووەکانیدا ئارامگەیەکی بۆ دروستبکەن. شێرکۆ بە وەسییەتنامەکەی مۆدێلێکی نوێی پەیوەندی لەنێوان نووسەر – مردن و گۆڕستان– فەزای گشتیدا دروستدەکات. شێرکۆ دەیەوێت بە بەخاکسپاردنی لە نێوەندی شاردا، مانای گۆڕ و گۆڕستانمان بۆ دەستکارییبکات. شێرکۆ دەیەوێت لە نێوجەرگەی فەزا گشتییەکەی شاردا ئامادەبێت و مۆدێلێکی نوێی پرسەمان بۆ بەرهەمبهێنێت. پرسەگرتن بۆ شێرکۆ بێدەنگیی نییە، بەڵکو قسەکردنە. بەم مۆدێلەش دۆخێک دروستدەکات گەر هەرکەسێکی تر، دوای خۆی، ئەم بیرۆکەیە دووبارە بکاتەوە، لاساییکردنەوەیەکی بێتامی ئەو بکات. بۆ شێرکۆ دوورکەوتنەوە لەفەزای گشتی مردنێکی ترە، جیاواز لە مردنە فیزیکییەکە. ئەو خواستی ئەوەی هەیە بۆ چرکەساتێکیش بەتەنها نەبێت، لەگەڵ نووسەران و شاعیران و گەنجان و کوڕ و کچی کوردستاندا بێت، دەیەوێت لەناو کتێبەکانیدا بێت و کتێبخانەکەی بەجێنەهێڵێت. ئەو دەیەوێت هەموو شتێک لە ماڵە نوێکەیدا ئازادبێت، تاکە شتێک کە دەشێت شارەوانی بتوانێت لەو ماڵە تازەیەیدا لە خۆی و مێوانەکانی قەدەغەی بکات، جگەرەکێشان بێت. ئەو نایەوێت بچێت بۆ گۆڕستان، نەک لەبەرئەوەی نایەوێت ژیانی داهاتووی لەگەڵ مردووەکاندا دابەشبکات، بەڵکو دەیەوێت ژیانی داهاتووشی لەگەڵ هاوڕێ و عاشقان و هاونیشتمانانی وڵاتەکەیدا بەسەربەرێت. گەر ئەم بیرۆکەیە گەورەتر بکەینەوە، شێرکۆ دەیەوێت گۆڕستان لە پەراوێزی شارەوە بگەڕێنێتەوە بۆ ناو ناوەندی شار. شوناسێکی نوێ بۆ مردووەکان دروستبکات، تاوەکو غەریب نەبن، تەنها نەژین، دەیەوێت ماڵەکانیان لە کەناری شارەوە بهێنێتە نێوەند، تاوەکو لەگەڵماندابن و لەناوماندابن.

وەکو ئاشکرایە گۆڕستانەکانی وڵاتانی ئێمە، هەمیشە لە قەراغ شار و دەرەوەی گوندەکانن. مردووەکان بەشێک نین لە فەزای گشتی. ئەو رەهەندە ئایینەی بۆ مردوو هەیە، لای شێرکۆ تەواو پێچەوانەیە. شێرکۆ هەروەکو چۆن لە ژیانیدا نوێگەربوو، دەیەوێت لە مردنیشدا هەر نوێگەربێت. ئەم نوێگەرییە بەتەنها لەو ترسە قووڵەوە سەرچاوە ناگرێت کە مردووەکان لە پەراوێزی کۆمەڵگەدان و بەتێپەڕبوونی کات تەنها کەسە نزیکەکانیان لە بۆنە ئایینییەکاندا بەسەریاندەکەنەوە، بەڵکو مانای ئەوەیە کە ئەو دەیەوێت رەهەندێکی تری دووبارە لەدایکبوونەوە لە کولتووری مردندا دروستبکات. لانیکەم ئەم کولتوورە لە وڵاتی ئێمەدا جێگای تێڕامانێکی قووڵە، چونکی تاوەکو ئەمڕۆ کەس نازانێت گۆڕی نالی لەکوێیە، کەسانێکی زۆر گۆڕی مەحوی ناناسن، کەم قوتابی و خوێندکار هەن بزانن ئارامگای پیرەمێرد و گۆران و قانیع و هەردی و... هتد، لەکوێن. ئەم ترس و خەمی دوورکەوتنەوەیە لە خەڵک، تەنها بەشێک نەبووە لە خولیاکانی شێرکۆی زیندوو، بەڵکو دەبن بەخەمێکی گەورەی تەنهابوون و پەراوێزکەوتن و لەیادچوونەوە لەلای شێرکۆی مردوو.

مرۆڤ تاکە بوونەوەرێکە هۆشمەندە بەرامبەر بەلەدایکبوون و مردنی خۆی، ئەو دەزانێت کە لەدایکدەبێت و دەشزانێت کە دەمرێت. لەدایکبوون بەمانای هاتن دێت بۆ ناو جیهان و مردنیش دەرچوونە لە جیهان. ئەم پرۆسەیە بەو مانایە نایەت کە ئێمە لە دەرگایەکەوە دێینە ژوورەوە و لە دەرگایەکی تریشەوە دەچینە دەرەوە، بەڵکو بەو مانایە دێت کە ژیان لەناو بازنەیەکی لولپێچیی بەردەوامدایە. لەم پرۆسەیەدا ژیان و مردن دوو دۆخی ناکۆک نین، دوو حاڵەتی دژ بەیەکتر نین، بەڵکو یەکتر تەواو دەکەن، چونکی هیچیان بێئەوی تریان ناتوانێت هەبێت، نەمردنی بەردەوام هەیە و نەژیانی بەردەوام. خولیای مرۆڤ بۆ نەمریی تەنها لە ئامادەبووندایە لەناو فەزای گشتییدا. هەر ئەم خولیای نەمرییەشە دەشێت لەدوای مردن مرۆڤ لە خوداوەند جیابکاتەوە.

شێرکۆ بەوەسییەتنامەکەی دەیـەوێـت پێمانبڵێت، تا ئەوکاتەی من لەناوتاندابم من هەم، تا ئەوکاتەی گۆڕەکەم قەرەباڵغبێت، من دەژیـم. کەی من لێتاندوورکەوتمەوە یان لێمدوورکەوتنەوە، ئەوکاتە مانای مردنی کۆتایی من دەستپێدەکات. ئەو پێماندەڵێت من دەمەوێت جیهان ماڵم بێت، نەک ماڵێکم لەجیهاندا هەبێت. ئەم ماڵە نوێیەی شێرکۆ ماڵێکی شەخسیی نییە، بەڵکو ماڵێکی گشتییە، رووبەرێکە کە هەموومان دەتوانین تیایدا گفتوگۆ بکەین، رای جیاوازمان هەبێت و بیر لەجیهان بکەینەوە. ئێمە ناتوانین بەتەنهایی بیر لەجیهان بکەینەوە. بۆیە شێرکۆ پێویستی بەو فەزا گشتییە بۆئەوەی بەردەوام بیربکاتەوە.

شێرکۆ بێئەوەی ئاگاداری فەلسەفەکەی هانا ئارێنت بێت لەسەر "نەمریی"، کەچی بە وەسییەتنامەکەی خۆی ئەو رەهەندە گرنگەی ئارێنتمان نیشاندەدات کە پێیوایە مرۆڤ لە رووە بیۆلۆگییەکەیەوە بوونەوەرێکە بەسەردەچێت، ئەوەی وا لەمرۆڤ دەکات نەمربێت بریتییە لە یادەوەرییەکان. ئینسانیش کاتێک یادەوەری بەرهەمدەهێنێت کە دوو شتی هەبێت، یەکەمیان کردەیە و دووەمیشیان وشە. ئەم دوو شتەش تەنها دەتوانن لەناو رووبەری گشتیدا نەمری خۆیان بپارێزن.

شێرکۆ دەیـەوێـت مـەزارگـاکـەی ببێت بەپەرلەمانێکی راستەقینەی نووسەران و شاعیران، کچان و کوڕان، عاشقانی ئـەدەب و فیکر و هونـەر؛ ببێت بەرووبەرێکی گشتی بۆ

قسەکردن و گفتوگۆکردن و بیرکردنەوە لەباشترکردن و جوانترکردنی جیهان و ببێت بەشوێنێک بۆ چێژوەرگرتن. ببێت بەپەرلەمانێک کە نەسەرۆکی هەبێت و نەدەوامی ڕەسمی، بەڵکو ڕووبەرێکی کراوە بێت کە جێگای هەموومانی تێدابیبێتەوە و پلورالیزمی ڕاستەقینەی گروپەکانی کۆمەڵگەی ئێمەی تیادا بپارێزرێت و ڕێزی لێبگیردرێت.

کۆمەڵگەی سیاسیی ئێمە بەچەشنێک پۆلاریزە و دابەشبووە، کە بۆ نووسەرەکانی ئاسان نییە نەبەزیندوویی و نەبەمردوویی سەربەخۆیی خۆیانی تێدا بپارێزن. ئاسان نییە هەڵوێستی نووسەرەکانی نەبن بەبەشێک لە سیاسەتی ئەم حیزب، یان ئەو ڕێکخراو. لەم جیهانەدا ئاسان نییە ئەوە بیت کە هەیت، چونکی ماشێنێکی گەورەی شوناسدابەشکردن و شوناسبەخشینەوە لە ئارادایە؛ پرۆسەیەک لە ئارادایە کە دەیەوێت ڕۆشنبیرەکان بکات بەوەی کە ئەوان دەیانەوێت.

گەر شێرکۆ لە ژیانی سیاسییدا ئینتیمای بۆ ئەم حیزب، یان ئەو ڕێکخراو هەبووبێت، ئەوە لەجیهانی ئەدەبدا بەتەنها موڵکی سلێمانی نییە، بەتەنها موڵکی کوردستانی باشوور نییە، بەتەنها موڵکی خۆرهەڵاتی ناوینیش نییە، بەڵکو شێرکۆ چیدی کتێبێکە لە کتێبخانەی ئەدەبی جیهانیی و شوناسێکی جیهانگەرایی هەیە. بۆیە تاکە حورمەتێک بۆ ئەم شاعیرە دابنرێت، ڕێزگرتنە لە شوناسە ئەدەبییەکەی و دابەشنەکردنێتی لە نێوان فەزا ناکۆک و دژبەیەکەکانی دونیای سیاسەتدا. چەندە نالی دامەزرێنەری زمانی ئەدەبیی کۆنی کوردییە، ئەوەندەش شێرکۆ دامەزرێنەری زمانی مۆدێرنی ئەدەبی کوردییە. بۆیە ئومێدم وایە هەروەکو چۆن سیاسییەکان هەموو شتێکیان لەنێوان خۆیاندا دابەشکردووە، ئەم سامانە نەتەوەیی و کتێبەشمان دابەشنەکەن. ئەم کتێبە موڵکی هیچ لایەکیان نییە، بەتەنها شانازیی هیچ حیزبێک نییە، ئینتیمای لەمڕۆ بەدواوە تەنها بۆ ئەوانەیە کە کتێبیان خۆشدەوێت، شیعریان خۆشدەوێت، کوردستانیان خۆشدەوێت و کەرامەتی ئینسان دەپارێزن و ڕێز لە عەشق دەگرن.

شێرکۆ لەڕووە فیزیکییەکەیەوە ماڵئاوایی لێکردین، بەڵام نایەوێت جارێکی تر بمرێتەوە. وەسییەتنامەکەشی خواستێکە بۆ لەدایکبوونەوە و دووبارە ئامادەبوون لە جیهاندا. ئەو بەوەسییەتەکەی پەیامێکمان بۆ دەنێرێت کە نایەوێت دووبارە بمرێتەوە، بەڵکو دەیەوێت جارێکی تر لەدایکبێتەوە. ئەو خەمی ئەوەی هەیە تەنهابێت و دەوری چۆڵ بێت، قسە نەمێنێت، کە قسەش نەما کرداریش دەمرێت. شێرکۆ ئەو ڕاستییەی باش دەزانی کە جیهانی گۆڕستان، جیهانێکی بێجووڵە و مردووە، جیهانێکە بێدەنگ و بێڕەنگ. بۆیە هاتنی بۆ ناوجەرگەی شار، هاتنەوەیە بۆ ناو جیهانی زیندووی ژیان، هاتنەوەیە بۆ ناو ڕووبەری گشتیی و لەدایکبوونەوەیەکی نوێیە. شێرکۆ دەیزانی کە مرۆڤ لەڕێگای لەدایکبوونەوە سەرەتایەکی نوێ دەستپێدەکات کە بەردەوامیی کۆتاییەکانی تر دەگەیەنێت.





پەیکەری شاعیری گەورە شێرکۆ بێکەس - پەیکەرساز هادی زیائەدین

# ماڵئاوا ئەستێرە گەشەکەی شیعری کوردی


















# لەئامێزی هەڵزناندا

كاكەمەم بۆتانی

"١"

هەرچەندە.. لاپەڕە پایزیەکانی هەر"سێ" بەرگی یاداشتەکانم، بۆنی شێرکۆی هەمیشە زیندووی گرتووە. هێڵکاری بوون و نەبوونمانی لە خوودی خۆی ئالاندووە... بەڵام.. ببورن.. بە ڕاستی ببورن.. لەم ساتە ڕەشپۆشەدا، دوای دواهەنگاوەکانم بکەوم.. بۆ پتر لە نیو سەدە بگەڕێمەوە.. ئازارەکان بە سووێ بێنمەوە، کارێکی گەلێ دژوارە.. من.. لە عۆدەی ڕاوی پەڵە زەردەکانی کفنە سپیەکەی نایەم..

هاوڕێیانم.. ئەگەر ئێوە.. جارێ.. تەنیا جارێ کۆستان کەوتووە.. من سێ جار شیوەنگێڕی کۆستکەوتووم.. هاوڕێی تەمەنم ڕۆ.. هاوخامەی ڕێبازی ڕوانگەم ڕۆ.. ئەندامێکی دیاری یەکێتیی نووسەرانم ڕۆ.. بەڵام – ناچارم، بەدەنگ داوای دەزگای "سەردەم"ەوە بچم.. چەند دێڕێ لە هەناسەکانی مێژوو هەڵێنجم... ساتەکانی ناسینیتان لەقەبەڵ کەم.

ئەرێ.. لەوە ناخۆشتر هەیە، بە دەستی خۆت ئازیزێکت بنێژی؟.. لە پرسەی قەڵەمێکی بوێرا.. گیانی نەمری بلاوێنیتەوە؟!.. ببورن.. ببورن.. هەر ئەمەندەم لەدەست هات..
گلەیی ئێوەش لەسەر چاوان.

"٢"

پەڵە هەوری بەهاری سەر گوندی "هەرتەل"، بارانی مەرگی تاکە مامۆستای قوتابخانەی دێی باراند.. خێزانی سەرگەردانی، لە بار و بارخانە شەتەک درا.. لاشەی ساردەوەبووی ناو دارەمەیتی بەدەم شین و شەپۆڕی کۆستکەوتوان، بەرەو خوار بۆوە. کاروانی پرسەی، لە قەبەڵ هەوری ڕەشی زەمەنی برسی و قاتوقڕی جەنگی جیهانی کرا.. بە دەم فرمێسکی دوو هەتیووی تازە، تەرمی چالاکەوانێکیتر، لە ئامێزی گۆڕستانی "عەرەبیان"ی "کۆیە" شاردرایەوە.. پاش چەند مانگێ، بێوەژنی جوان و جەحێڵ و هەردوو کوڕی، بەرەو "سلێمانی" بەڕێکران.. هەر دوو منداڵ لە ماڵی خاڵانی بەخێو دەکران!
منی.. دەساڵە.. لە هەموو لایەکەوە، سەرسام و سەرلێشێواو بووم.. ساتەکان، لە ژیانی تازە ئالابوون.. لە دێیەکی دوورە شارا، بۆ شارێکی پڕ ژیان و چالاکی، شاری کڵپەی کوردایەتی، بزووتنەوەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی.. لە ئامێزی برسیەتی و قاتوقڕی.. لە قوتابخانەی "گۆیژە" دانرام و حەپەسام، سەرنجەکانمی دەخنکاند.. تا فێر دەبووم، گومانم پتر دەبوو.. هەرچیم دەدی، هەرچیم دەبیست، نوێ بوون..

ڕۆژێکی ساردی تەمەنی فێر بوون، زەنگی قوتابخانە لێدرا.. بە دەنگە دەنگ و چرپە چرپ.. ڕیزکراین.. لەبەر دەرکی سەرا، چاوەڕوان بووین.. تەرمێ بەلامانا تێپەڕی و کۆمەڵە پیاوێکی مەلوول بەدوایا.. ئێمەش دوایان کەوتین.. بەدەم "فاتیحا"ی ڕێبوارانەوە، دەمبیست:
– فایەقە فەندیش جێی هێشتین.
– ماڵئاوا.. دەنگی زوڵاڵی کوردایەتی.. ماڵئاوا.. ماڵئاوا..
– ئینگلیز.. لەوەش بە بەختن.. مڵۆزمێکیان لە کۆڵ بووەوە..

بە شەقامی سەرەکی گەڕەکی "سابونکەران" هەڵزنان، لەبەردەمی "کەشتی نوح"ی نەجمەدین مەلا، تەرم گوڵباران کرا.. ژن و منداڵ، لە دارەمەیت ڕادەمان.. منیش.. بەدەم یادی ساتەکانی کۆچی باوکم، فرمێسکم دادەباراند.. هەستم، لە نەبوونی و هەتیویی خۆمدا دەخنکاند..

ئا.. لێرەوە.. شێرکۆی "نەناس"م بووە هاوڕێ، ئەویش ژیانی لای خاڵوانی دەپریواند.. ئا.. لێرەوە شێرکۆ و فایەق بێکەسم ناسی.. لەپاشا، بە هەڵبەستە نیشتمانیەکانیان ئاشنا بووم.. تەرمی بێکەسی کوردایەتی، بە سەد پیاوێ بەڕێکرا.. ئاپوورەی قوتابیان، ڕێپێوانی گەورە کردبوو.. کە گەڕامەوە ماڵ، کۆمەڵە پرسیارێکم لە کۆشی خاڵی گەورەم کرد.. هەرچی وت و، شی کردەوە و بیانووی هێنایەوە.. منی ڕازی نەکرد.. لای من ژیان و کاری "بێکەس" لەگەڵ ژیان و کاری "زۆر کەس" بەراورد نەدەکرا.. تا ئیمڕۆش بەراوردم پێناکرێ!!

"٣"

زروفی فەرمانبەری خاڵی گەورەم و هەڵوێستی خاڵی بچووکم "ساڵی ١٩٥٣" ئێمەی هەتیوی گەیاندە کەرکوکی شاری زێڕی ڕەش.. منیش خۆم لە ریزی یەکێتی قوتابیانی کوردستانی "نهێنی" دیتەوە.. هەندێ وردەکاری نهێنی و تایبەتی پارتی دیموکراتی کوردستانیشم پێدەسپێردرا..

هەر لە مێردمنداڵییەوە، فێریان کردبووم، لە کارە تایبەتیەکاندا.. هەرچی دەبینم، دەبیستم.. بۆ نزیکترین هاوڕێی نەگێڕمەوە.. لە هێنان و بردنی نامەکان نەکۆڵمەوە.. هەڵیان نەپچڕم..
لە ڕۆژێکی هاوینی ١٩٥٤ دا، بە کارێکی تایبەتی خاڵی بچووکم، چوومە ماڵی سەرکردەی نەمر ئیبراهیم ئەحمەد کە لە گەڕەکی "ئیمام قاسم" بوو. بێ لەدەرگادان، چوومە ژوورەوە.. کوڕ و کچێکی غەریبی لێبوو، بەدەم جێبەجێکردنی داواکە، گەلاوێژخان وتی:
– مەمۆ.. نایانناسی؟!. ئەوە فریشتەخان و کاکە شێرکۆی فایەق بێکەسی شاعیرن.
بەجۆر و ڕێزێکی واوە ناویان و ناوی بێکەسی هێنا.. هەموو هەستمی بەلایانا ڕاکێشا.. بە خۆشییەوە لێیان نزیک بوومەوە.. بەخێرهاتنم کردن..



هەستی هەتیوییم، لە ئازاری هەتیوویی ئەوان ئاڵا، ساتەکانی کۆچی دوایی و ناشتنی هەردوو "باوک" سەریان هەڵدایەوە.. دیسان گومانەکان یەخەیان گرتم.. بەڵام زوو خۆم دەرباز کرد.. سەیری بەژن و باڵا و جل و بەرگیان، دەمو دوویانم کرد..
هەرچەندە ناتوانم بە تەواوی یەکەم دیدار تۆمار بکەم.. ئەوەی لەبیرم مابێ: شێرکۆ مێردمنداڵێکی خڕپلەی پێست گۆشتی، چاو زیت، شەرواڵ لەبەرێکی مەلوولی کەم دووی شەرمن بوو.. ئەو ڕۆژانەی لەو ماڵەیانەوە چەند جارێ بەدیداریان گەیشتمەوە.. بەهەڵە نەچووبم.. یەک — دوو جاریش، پێکەوە بە گەڕەکی ئیمام قاسم دا گەڕاین.. زۆربەی قسەمان باسی خوێندن و ژیانی ڕۆژانەمان بوو.. ئەویش خاڵوان لە ئامێزیان گرتبوو.. دایکی هەردووکمان بە جوان و جحێڵی بێوەژن بوو بوون، بەڵام دایکی ئەو شویکردبۆوە، دایکی منیش لە ماڵە برایان سەرپەرشتی ئێمەی دەکرد.
لەوجارەوە.. هەر کە شێرکۆ خۆی بە تەنیا، یان لەگەڵ خوشکی سەری لە ماڵی "کاکە بلە"ی نەمر بدایا.. لە هەواڵی دەپرسیم.. بەڵام دۆستایەتیم سەرپێیی بوو. پاش چەند ساڵێ.. خۆمان لە دنیای ئەدەبدا دۆزییەوە.. من بە نازناو کارەکانم بڵاو دەکردەوە، ئەویش هۆنراوەکانی بە ناوی خۆی پەخشدەکرد.. هەریەکەمان، ڕێبازێکی ڕامیاری جیامان گرتبوو.. بەڵام سەرچاوەی هەردوو کوردایەتی بوو.
کە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ١٩٥٨ بەرپا بوو.. لە چوونە "سلێمانی"مدا هەواڵیم لە برادەرانم دەپرسی.. بەڵام هاوڕێی و دۆستایەتیمان کز بوو.. لە دنیای ئەدەبیشدا یەکترمان دەخوێندەوە.. ئەم دیدەنیانە، نەگەیشتنە هاوڕێی و هاودەنگی یەکتری.. دیارە زروفی کۆمەڵایەتی و ژیانی ڕۆژانەمان دەوری زۆری هەبوو.. چونکە تا ئەوساتە چاومان لە دەستی خاڵوان بوو.

"٣"

کە لە دانووسانی ساڵی ١٩٦٤دا بۆ تەواوکردنی خوێندن، لە پێشمەرگایەتی گەڕامەوە شار، پاش ماوەیەک لە بەڕێوەبەرایەتی دارستانی بەغدا دامەزرام. شێرکۆش بەتەنیا لە وەزارەتی کاروباری باکوور، فەرمانبەر بوو، لە ڕۆژنامەی "خەبات"ی باڵی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانیش کاری دەکرد.. جگە لەوەی بە یەک شاد بووینەوە، دنیای سیحری ئەدەبیش دەیبزواندین.. هەموو هۆیەکان لەباربوون لێک نزیک ببینەوە..
لە دنیای ڕووناکبیرییەوە بۆ دنیای ڕامیاری، ململانێی هەردوو باڵی پارتی دیموکراتی کوردستان و لایەنگیری "کاژیک" بۆ باڵی سەرۆک.. لەکاتی بێکاری دائیرەدا، لە چاپخانەکانی پایتەختدا، لە مەیخانەکاندا.. باسی سەرەکیمان ئەدەب و قوتابخانە ئەدەبیەکان بوو. هەندێجار هۆنراوە تازەکانی خۆی دەخوێندەوە، منیش بیرۆکەی چیرۆکەکانم بە گوێیدا دەدا. لەو ساڵانەدا.. بەشی کوردی لە زانکۆی بەغدا و بەڕێوەبەریەتی



کاکە مەم بۆتانی - شێرکۆ بێکەس - ڕەئووف بێگەرد

خوێندنی کوردی، ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی دەردەچوون، ڕووناکبیر و ئەدیبانی کورد بەڕێوەیان دەبردن.. ئێمەش دەچووینە لایان، بەڵام هیچیان نەگەیشتنە دۆستایەتی ڕۆژانەی ئێمە.. تا.. حوسێن عارفی خێزانداری تازە لە بەندیخانە ڕزگار بوو.. هاتە بەغدا.. هەر زوو سێکوچکەیەکی هەمیشەییمان پێکهێنا..

تا ئێستاش.. هەندێجار.. بیردەکەمەوە چی وایکرد ئێمە بکاتە هاوڕێی تا مردن؟!.. لە دنیای ڕامیاریدا: شێرکۆی کاژیک و نزیکی باڵی سەرۆک. کاکەمەمی تازە گەڕاوە و دەستبەرداری پارتایەتی و لایەنگیری باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی. حوسێن عارفی کۆمەنستی نزیکی باڵی "قیادەی مەرکەزی" چۆن بوونە هاوڕێ؟ خۆ زۆرتریش هەبوون لەسەر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان یەکڕابوون!.. بەیەکەوە نەدەگونجاین..

ناکرێ.. لەم کورتە باسەی یەکتری ناسینەدا، خۆم لە باسێ بشارمەوە کە لەناو هەموو ئەدیب و ڕووناکبیرانی ئەو سەردەمەی بەغدا باو بوو!.. ئێستاش دەگێردرێتەوە.. وەک لەبیرم مابێ، لە شەوی مەیخانەیەکی شەقامی "ئەبو نواس"دا دەستپێیکرد.. بەدەم خواردنەوە و ئەدەب و تازەگەرییەوە. بەرەو دنیای ئافرەت و دڵداری و خۆشەویستی چووین.. نازانم چۆن ڕستەی "کاممان قۆزترین" سەریهەڵدا.. هەریەکەمان عەیبی ئەویتری دەژمارد و برادەرانی هاومێزمان باسەکەیان پتر دەگەشاندەوە. هەندێ لای من و هەندێ لایەنگیری شێرکۆ بوون.. خۆزگە ئەم پێشبڕکێیە درێژەی هەبوایا!!.. با منیش دۆڕا و بوومایە.

وەک لە سەرەتای ئەم یادەمدا، بە وردی لە ناشتنی دەنگی خەبات و ڕاپەڕینی کوردایەتی "فایەق بێکەس" دوام.. گومانەکانم دەورکردەوە..

ناکرێ.. لە یادی یەکترناسینی من و شێرکۆی هەمیشە زیندوودا، دەوری دەسەڵاتی ڕامیاری هەرێم و ئاپوورەی جەماوەری شارەکانی کوردستان فەرامۆش بکەم کە لە: هێنانەوەی تەرمی، لە پێشوازی گەرمی، لە ناسۆری ناشتنی،.. لە پرسەی مەلوولیدا.. تەواوی دڵسۆزی و ڕێزیان نیشاندا.. تۆڵەی ناشتنی فایەق بێکەسیشیان کردەوە..

بۆیە.. من.. وەک هاوڕێیەکی نیوسەدەی، هاوخامەی ڕوانگەی، سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی کورد.. سوپاسی هەموویان دەکەم.. ئاواتەخوازم تەرمی هەموو قەڵەمە بوێرەکان، بەشانازییەوە بەڕێ بکرێن — تا ئەدیبانمان چاویان لێکەن.. درێژە بە خەباتی ڕامیاری و ئەدەبی بەرەنگاری بدەن.. چونکە تاکە ڕێگای ڕزگاری و یەکێتی نیشتمانە.



عوسمان قاوەیەک بۆ شێرکۆ بێکەس دادەنێ: ئەو مێزو کورسییەی کافیتریای دەزگای سەردەم کە مامۆستای نەمر هەر لەو جێیەدا دادەنیشت





د.نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

# بایەخی شێرکۆ بێکەس لە ئەدەبی عەرەبیدا





## سەرەتایەک

لە مێژووی هەر نەتەوەیەکدا، چەند شاعیرێکی کەم دەتوانن ببن بە شاعیری نەتەوە و شاعیری داهێنەر کە کاریگەرییان لە مێژوودا زۆر درێژ دەبێتەوە، دەشێت ئەم کاریگەرییە سنووری نەتەوەکەی خۆی جێبهێڵێت و بپەڕێتەوە بۆ نێو کولتوور و ئەدەبی نەتەوە نزیک و دوورەکانیش، واتە «داهێنان» هۆکارێکی گرنگ و چالاکە بۆ ناساندنی شاعیر، یان ئەدیب، لە ئاستی جیهانیدا و هەروەها گەیاندنی ناوەرۆک و پەیامی هیومانیستیی ئەدەبی بە ئەدەب و کولتووری گەلانی دی، زۆربەی شاعیر و ئەدیب و نووسەرە ناودارەکانی دنیا لە ڕێگەی ئەدەبی لۆکاڵییەوە گەیشتوونەتە ئاستی ئەدەبیاتی جیهانی، هەر بۆ نموونە وەک پووشکین و گۆگۆڵ و چیخۆف و دۆستویڤسکی و لیرمەنتۆف و تۆلستۆی لە ئەدەبی ڕووسی، بلزاک و فلوبێر و ئیمیل زۆلا و ستاندال و ڤیکتۆر هۆگۆ لە ئەدەبی فەرەنسی و جێمس جۆیس لە ئەدەبی ئێرلەندی و کازانتزاکی لە ئەدەبی یۆنانی و گابریل گارسیا مارکیز و جۆرج ئامادۆ لە ئەدەبی ئەمریکای لاتین و نەجیب مەحفوز لە ئەدەبی عەرەبی و ئۆرهان پاموک لە ئەدەبی تورکی و زۆری تریش.



لەگەڵ ئەدۆنیسدا

بێگومان لێرەدا وەرگێڕان ڕۆڵێکی ئێجگار گرنگ و یەکلاکەرەوە دەبینێت لە ناساندنی کولتووری نەتەوەیەک و هەروەها بەرهەمی شاعیرێک بە دەرەوەی زمان و کولتوور و نەتەوەکەی خۆی، بایەخدانی وەرگێڕانیش بە شاعیرێکی دیاریکراو و گواستنەوەی بەرهەمەکانی بۆ زمانانی تری دونیا، هەروا لەخۆڕا ئەنجام نادرێت، واتە ئەمە کارێکی ئیرادەگەری و خواستئامێز نییە تۆ بە زۆر بتەوێ بەرهەمی شاعیرێک وەربگێڕیت و بە دنیای دەرەوەی بناسێنیت، ئەگەر ئەو شاعیرە خۆی توانایەکی گەورەی نەبێت و داهێنەرێکی ناوازە نەبێت، هەرگیز وەرگێڕان بە تەنها ناتوانێت ئەو شاعیرە بەدنیا بناسێنێت، ئەدیب و نووسەری وا هەن بەرهەمەکانیان وەرگێڕدراون بۆ زمانانی دی کەچی لە دەرەوەی نەتەوەکەی خۆیاندا ناوبانگ و کاریگەرییان نەبووە، ئەدیبی وایش هەیە بە وەرگێڕانی تەنها یەک ڕۆمان، یان بە وەرگێڕانی کۆمەڵە شیعرێک، سنووری زمان و کولتووری نەتەوەکەی جێهێشتووە و لە ئاستی ئەدەبیاتی جیهانیدا کاریگەریی هەبووە، ئەمە لەبەر ئەوەی ئەو نووسەرە داهێنەر بووە و خاوەن توانایەکی تایبەتی ئەدەبی، یان شیعریی بووە.

شێرکۆ بێکەس لەو شاعیرانەیە کە لە ماوەی نیو سەدەی کاری شیعری و داهێنانی ئەدەبیدا و لە میانی وەرگێڕانی زۆربەی شیعرەکانی بۆ چەندین زمانی دنیا، توانیویەتی سنووری زمانی کوردی و نێوەندی ئەدەبی کوردی جێبهێڵێت و بەتەنها لەو چوارچێوەیەدا نەمێنێتەوە، بەڵکو لە ئاستی ئەدەبیاتی گەلانی دراوسێ و بگرە ئەدەبیاتی جیهانیشدا بناسرێت. لەنێو ڕۆشنبیران و ئەدەبیاتی عەرەبیشدا بە ئەندازەیەکی زۆر ناسراوە و بەرهەمەکانی دەخوێنرێنەوە، چونکە بەشی هەرە زۆری شیعرەکانی کراون بە عەرەبی و لە دەزگا جیاجیاکانی بڵاوکردنەوەدا چاپ کراون و بە ئاسانی بەردەستی خوێنەران و ئەدیبانی عەرەب کەوتوون.

### دەنگدانەوەی شێرکۆ بێکەس
### لە نێوەندی کولتووری عەرەبیدا

زۆربەی نووسەران و ڕەخنەگرانی عەرەب کە شیعرە

وەرگێڕدراوەکانی شێرکۆ بێکەسیان خوێندۆتەوە، لێکۆڵینەوەیان لەسەر نووسیوە و بیروڕای خۆیان دەربارەی ئەم شاعیرە دەربڕیوە، من لەمیانی خوێندنەوە و بەدواداچوونی ئەم بابەتەدا بۆم دەرکەوتووە زۆربەیان پێیان وایە شێرکۆ بێکەس توانیویەتی چەمکێکی هیومانیستی و جیهانیی بە شیعری نەتەوەیی کوردی ببەخشێت و شیعری کوردی لە چوارچێوەیەکی تەسکی ناوچەییدا دەربهێنێت، لە ڕێگەی وەسفی سروشتی کوردستان و شۆڕشەکانی کورد و ژیانی مەرگەساتباری کوردانـدا شیعری کـوردی بگەیەنێتە دەرەوەی سنورەکانی خۆی، چونکە شیعری بە خاک و ئەوین و ئازادییەوە گرێ داوە و لەوێشەوە خەمی کوردیی کردووە بە خەمێکی عێراقی و بگرە هەموو خۆرهەڵاتی نـاوەڕاسـت، کە هەندێ لە ڕەخـنـەگـرانـی عێراقیی بۆ نموونە وەک یاسین نەسیر، پێی وایـە شێرکۆ بێکەس بـەتـەنـهـا شـاعـیـری کـورد نییە، بەڵکو شاعیری هەموو عێراقە. هەندێکیان جەخت لەوە دەکـەن کە لە ڕێگەی شیعری شێرکۆ بێکەسەوە شیعری کوردییان ناسیوە و پاشان بۆیان دەرکەوتووە شیعری شێرکۆ لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ناسراوە.

بێگومان لە حەفتاکان و هەشتاکاندا شیعری شێرکۆ بێکەس و لەتیف هەڵمەت و زۆر شاعیری دی دەکران بە عەرەبی، بەڵام بەزۆری لەناو عێراق و کوردستاندا دەخوێنرایەوە، وەک بەبیرم بێت یەکەم کۆمەڵە شیعری شێرکۆ بێکەس بە عەرەبی لە ساڵی ١٩٨٨ لە دیمەشق چاپ کرا بەناونیشانی (مرايا صغيرة)، کە ئەمە بووە مایەی سەرنجراکێشانی خوێنەر و ڕەخنەگرانی عەرەب، چونکە دواتر ئەم کتێبە لە پایتەختی وڵاتە عەرەبییەکانی تریش بـڵاوکـرایـەوە، لـەپـاش ڕاپـەڕیـن دەروازەی وەرگێڕانی شیعری شێرکۆ بێکەس و شاعیرانی تری کورد بۆ عەرەبی و گەیاندنی بە خوێنەرانی عەرەب، بە ئەندازەیەکی بەرچاو، کرایەوە، کە بێگومان کاک شێرکۆ خۆیشی ئاگاداری ئەو هەوڵانە بوو و یارمەتیی وەرگێڕەکانی دەدا هەم بۆ ئەوەی وەرگێڕانێکی باش دەربچێت و هەم بۆ چاپکردنی.

ئەوەندەی من لەبیرم بێت و لە کتێبخانەکەی خۆمدا هەبێت، تا ئێستا شێرکۆ بێکەس ئەم کتێبانەی کراون بە عەرەبی: لەساڵی ١٩٩٥ لە گۆڤاری (ادب ونقد)ی میسریدا تەڵعەت الشایب کۆمەڵێ شیعری هەڵبژێردراوی شێرکۆ بێکەسی بە عەرەبی بەناوی (الديوان الصغير) بڵاوکردۆتەوە و پێشەکییەکی بۆ نووسیوە. هەروەها کاک ئازاد بەرزنجی «دەربەندی پەپوولە»ی کردووە بە عەرەبی بەناوی (مضيق الفراشات) لە ساڵی ١٩٩٦ لە دار الرازی لە بەیروت چاپکراو وەک وتم ئەم شیعرە دەنگدانەوەیەکی زۆری لە ئەدەبی عەرەبیدا هەبوو. پاشان کاک ئازاد بۆننامەی تەرجەمە کرد بەناوی (سفر الروائح) کە لەساڵی ٢٠٠٠ لە کتێبێکی سەربەخۆدا بڵاوکرایەوە.

کتێبی دوو سـرووودی کێوی (انشودتان جبليتان) لەلایەن فوئاد عەبدولڕەحمان کـراوە بە عەرەبی و لەساڵی ٢٠٠٣دا چاپ کراوە.

کتێبی تۆ هەوریت و دەتبارێنم (انت سحابة..فأمطرك) لەساڵی ٢٠٠٤ دانا ئەحمەد کردوویەتی بە عەرەبی.

کتێبی ملوانکە (کتاب القلادة) هیوا عەزیز کردوویەتی بە عەرەبی و محێدین زەنگنە پێیدا چۆتەوە و لەساڵی



**لەگەڵ جەلیل قەیسیو هاوڕێیانی سەردەمدا**

٢٠٠٩ له دار الجمل له بەیروت و بەغدا بڵاوکراوەتەوە.
شیعری کورسی لەلایەن هیوا عەزیزەوە کراوە بەعەرەبی و د.شاهۆ سەعید پێیدا چۆتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە و لەساڵی ٢٠٠٩ چاپ کراوە. هەروەها ئەم قەسیدەیە سامی داوودیش کردوویەتی بەعەرەبی و لە دیمەشق چاپ کراوە.

کتێبی رەنگدان (دورق الالوان)، یان (اناء الالوان) لەلایەن کاک شاهۆ سەعید کراوە بەعەرەبی و لەساڵی ٢٠٠٩ چاپ کراوە و پێشەکییەکی دوور ودرێژی بۆ نووسیوە بە ناوی (رحله الشعر الكردی من باباطاهر الی شیرکو بیکس) کە لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەییە دەربارەی شیعرەکانی کاک شێرکۆ.

کتێبی (ملک الكلمات) کە خوالێخۆشبوو سەلاح بەرواری وەریگێڕاوە و لەساڵی ٢٠٠٨ لە دار الینابیع لە دیمەشق چاپ کراوە.

کتێبی (انبهارات) لەلایەن کۆمەڵێ وەرگێڕەوە کراوە بەعەرەبی و ئازاد بەرزنجی هەڵیبژاردوون و پێداچوونەوەی بۆ کردوون، لەساڵی ٢٠١٠ لە پەخشخانەی ناوداری میسری (المركز القومی للترجمه) لە قاهیرە چاپ کراوە.

خۆیشم لە کتێبی (نصوص كردیه حدیثه)دا هەندێ شیعری کاک شێرکۆم وەرگێڕاوە و ماوەیەکی تر سەرجەمی شیعرەکانی «حەفتا پەنجەرەی گەڕۆک» (سبعون نافذه متجوله) چاپ ئەکەم.

بێگومان شێرکۆ بێکەس سەفەرەکانی بۆ وڵاتانی عەرەبی و ئەوروپی دەقۆستەوە و لەوێ بە کوردی و عەرەبی شیعرەکانی خۆی لەکۆڕی بەرفراواندا پێشکەش دەکرد، بۆ نمونە لە ساڵی ١٩٩٧ لە ستۆکهۆڵم لە کۆڕێکدا ژمارەیەکی زۆری ڕۆشنبیرانی عەرەب ئامادە بوون و کاک شێرکۆ شیعرەکانی بە عەرەبیش خوێنراونەتەوە و بوونەتە مایەی سەرسوڕمانی خوێنەرانی عەرەب، هەروەها لە دیمەشق و بەیروت و قاهیرە بە کوردی و عەرەبی کۆڕی شیعریی پێشکەش کردووە، کەناڵی ناوداری (العربیه)ش لە بەرنامەکەی ئەحمەد عەلی زێن بەناوی (روافد) دیدارێکی دورودرێژی لەگەڵدا کراوە و لەوێشدا هەم بە کوردی و هەم بە عەرەبی هەندێ لە شیعرەکانی خۆی خوێندەوە.

## شێرکۆ بێکەس و ئەدۆنیس

لە ڕێکەوتی ٢٠٠٩/٤/١٨دا، ئەو کاتەی (ئەدۆنیس)ی شاعیر و بیرمەندی گەورەی عەرەبی، لەلایەن بنکەی ڕووناکبیریی گەلاوێژەوە بانگهێشتی کوردستان کرابوو، لە زۆربەی دانیشتنەکانماندا شێرکۆ بێکەس لەگەڵماندا بوو و لەگەڵ ئەدۆنیسدا گفتوگۆی ئەدەبی و شیعریمان دەکرد و بیروڕای خۆمان ئاڵوگۆڕ دەکرد، کە هەندێجار بۆچوونەکان جیاواز بوون، بەتایبەتی لەنێوان ئەدۆنیس



جەلیل قەیسی - شێرکۆ بێکەس



و شێرکۆ بێکەس لەبارەی شیعر و ئامانج و پەیامی شیعر، بەو پێیەی ئەدۆنیس پتر داکۆکیی لە شیعرییەتی شیعر و لە ئیستاتیکا و ڕوانینی شیعری دەکرد، کاک شێرکۆش پتر گفتوگۆکەی بەلای شیعری بەرگری و شیعری نەتەوەییدا دەبرد.

لە ئەدۆنیسم پرسی ڕات چییە بەرامبەر شیعرەکانی شێرکۆ بێکەس، ئەویش ئەم چەند وشەیەی نووسی: باوەڕم وایە کاتێک ئێمە پشت بە خوێندنەوەی شیعری وەرگێـڕدراو دەبەستین بۆ هەڵسەنگاندنی، ئەوسا بەهایەکی زۆری شیعر لەدەست دەدەین، بەتایبەتی ئەو لایەنانەی پەیوەستن بە شیعرییەت و زمانەوانی و مۆسیقا. وەرگێڕان هیچمان پێشکەش ناکات جگە لە هەندێ بیرۆکە و هەندێ وێنە، بەڵام بیرو وێنەکان ئەگەر لە چوارچێوەیەکی پەخشانی (واتە وەرگێڕدراو) تەماشا بکرێت، ئـەوا تایبەتمەندییە شیعرییەکەی لەدەست دەدات.

کەواتە، ئەگەر بۆمان هەبێت شیعرێک بەمانای وردی وشەکە هەڵسەنگێنین، ئەوا من لەمیانی خوێندنەوەی شیعرە وەرگێڕدراوەکانی شێرکۆ بێکەسدا کەشێکی شیعریم بینی ئەگەرچی پەخشانئامێزیش بـوون، کەشێکی شیعریی بڵند، ئەمە لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە شیعرە لەسەر شڵەژان و پێکەوە گونجانی نێوان لایەنەکان ڕادەوەستێت، هەروەها چوونە نێو بزاوتی شتەکان و جیهان بە شێوەیەکی شاقوڵی.

ئەم جۆرە کەشوهەوا شیعرییە تەنها لەلای شاعیرە ڕاستەقینەکاندا هـەیـە، ئـەمـانـە لـەودیـوی زمانە ئەسڵییەکەی خۆیاندا و لە زمانانی دیشدا ئەو چەشنە کەشوهەوایە دەخوڵقێنن.

بەم مانایە، شێرکۆ بێکەس، بە یەکێک لە شاعیرە ڕاستەقینەکان و بەیەکێک لە شاعیرە گـەورەکـان دادەنرێت»

## شێرکۆ بێکەس و گۆڤاری (سردم العربی)

شێرکۆ بێکەس خۆیشی هەوڵیداوە شیعری کوردی لە چوارچێوەی نەتەوە و هەروەها لە چوارچێوەی سنووری جوگرافیایەکی نەتەوەیی دەربهێنێت و بگاتە ڕووبەرێکی بەرینتر، بۆیە شیعری بۆ خەم و ئازاری نەتەوەکانی تر و بۆ کەسایەتییە عەرەبییەکانیش نووسیوە و چەندین شیعری بۆ عێراق و بـارودۆخـی پڕ لە نەهامەتیی ئەمڕۆی عێراق نووسیوە، هەوڵیداوە نزیک بێت لە ڕۆشنبیران و نووسەرانی عەرەب لە عێراق و وڵاتانی تری عەرەبی، بۆیە دەبینین دۆستی ژمارەیەکی زۆری ڕۆشنبیران و ڕەخنەگرانی دنیای عەرەبی بوو، هەمیشە خواستی ئەوەی هەبوو شیعرەکانی بکرێن بە عەرەبی و خوێنەری عەرەب شیعری کوردی بناسێت، ژمارەیەکی زۆری شیعرەکانی کراون بە عەرەبی، دەشێت هەر ئەم خواستەش بووبێت هانی دابێت هەوڵی زۆر بدات لە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم گۆڤارێک بە زمانی عەرەبی دەربکات، ئەوەبوو لەپاش ڕووخانی ڕژێمی بەعس لە ساڵی ٢٠٠٣دا، چەندین کۆبوونەوەی پێکردین بۆ دەرکردنی گۆڤارێکی لەو چەشنە کە هەندێکمانی ڕاسپارد کار بۆ دەرکردنی گۆڤاری سردم العربی بکەین، بە تایبەتی ئازاد بەرزنجی و ڕەووف بێگەرد و شاهۆ سەعید و من، دواتر دانا ئەحمەد، ئەمانە بووین بە ستافی گۆڤارەکە و کاک شێرکۆش بەردەوام پشتگیری و موتابەعەی ئەکردین. ئـەوەبـوو لە ژمـارە دووی گۆڤارەکەدا مەلەفێکی تایبەتیمان بۆ شێرکۆ بێکەس کردەوە.

ئەم گۆڤارە کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبوو لە ناساندنی ئەدەب و کولتووری کوردی بە جیهانی عەرەبی کە لەوێوە بایەخێکی زۆر درا بە وەرگێڕانی بەرهەمەکانی شێرکۆ بێکەس بۆ زمانی عەرەبی، کە دواتر هەم لە زۆربەی ژمارەکانی گۆڤارەکەدا بڵاومان دەکـردەوە و هەم لە شێوەی کتێبدا چاپمان دەکرد، ئەمە سەرنجی ژمارەیەکی زۆری خوێنەر و نووسەر و ڕەخنەگرانی عەرەبی ڕاکێشا لە نزیکەوە لە دنیای شیعریی شێرکۆ بێکەس ئاشنا بن. بێگومان پێشتریش هەوڵی زۆر و جدی درابـوون بۆ تەرجەمەکردنی شیعرەکانی کاک شێرکۆ بۆ عەرەبی کە وەرگێڕانی دەربەندی پەپوولە لەلایەن ئازاد بەرزنجییەوە سەرسامیی ڕەخنەگرانی عەرەبی بۆ شیعری شێرکۆ ڕاکێشا. لە ژمارە دووی ساڵی ٢٠٠٣ی ئەو گۆڤارەدا کە دۆسییەکی تایبەتیمان لەسەر شێرکۆ بێکەس دەرکرد، لەوێدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە شیعری شێرکۆ بێکەس لە هەشتاکاندا لە مەنهەجی قۆناغی ناوەندیی قوتابخانەکانی ئەمریکادا دەخوێنرێت، لە کاتێکدا ڕژێمی بەعس شیعرەکانی ئەو شاعیرەی قەدەغە کردبوو. دەشێت لە دەرفەتێکی تردا بە جیا و بە تەفاسیلی زیاتر باسی شێرکۆ بێکەس و گۆڤاری سەردەمی عەرەبی بکەم.

# ژیان
# لە سەردەمی
# شێرکۆ بێکەس دا



**بەکر شوانی**

هاوینی ساڵی ١٩٧٧ کاتێک تەمەنم ٩ ساڵ و لە پۆلی دووەمی سەرەتایی بووم، بە ڕێککەوتێکی سەیر دیوانی "تریفەی هەڵبەست"ی شاعیری گەورە شێرکۆ بێکەسم دەستکەوت. ئەو دیوانە هاوتەمەنی خۆم بوو، چونکە هەردووکمان ساڵی ١٩٦٨ هاتبووینە دنیاوە. بە خوێندنەوەی شیعرەکانی "تریفەی هەڵبەست" کەوتمە بەر ئەفسوونی زمانی شاعیر و لەگەڵ هەر خوێندنەوەیەکدا هەستم دەکرد لە بنی تاڤگەیەکدا ڕاوەستاوم و لەبری ئاو، وشە بەسەرمدا دەڕژێت. ساڵانی دواتر شیعر و دیوانەکانی تری شێرکۆ بێکەسم خوێندەوە و ئەو زمانەی ئەمڕۆ لە نووسین و وەرگێڕاندا بەکاری دەهێنم، بەشێکی زۆری لە ژێر کاریگەریی زمانی شیعرەکانی ئەودا نەشونمای کردووە.

ڕۆژگار هات و ڕۆژگار ڕۆیشت و ڕۆژێکی گەرمی هاوینی ساڵی ١٩٩١ لە چەمچەماڵەوە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکدا چووین بۆ سلێمانی بۆ کۆڕی شیعری شێرکۆ بێکەس. پاش ئەوەی ماوەی سەعات و نیوێک گوێمان لە شیعرە بەتام و چێژەکانی گرت، لە دەرەوەی هۆڵی ڕۆشنبیریی جەماوەر بینیمان و من یەکەمجار لە ژیانمدا لەوێ دەستم نایە نێو دەستی. ئەوە سەرەتای هاوڕێیەتییەک بوو کە تا ڕۆژەکانی دوایی ژیانی ئەو کێوی شیعرە درێژەی خایاند. لە ساڵی ١٩٩٥ بەدواوە ساڵی چەند جارێک لە ئەوروپا و ساڵانی دواتریش لە کوردستان و ئەوروپا یەکدیمان دەبینی. کاک شێرکۆ هاندەرێکی زۆر گەورەی من بوو لە کاری وەرگێڕاندا و لەم ساڵانەی دواییشدا پاش ئەوەی کۆمەڵێک ڕۆمان و بابەتی ترم لە تورکییەوە وەرگێڕا، ڕۆژێک پێمی گوت: "باشە، دە وەرە کارێکی وەرگێڕانی پێچەوانەیش بکە." ئیتر لەوێوە بیرۆکەی وەرگێڕانی بەشێک لە شیعرەکانی بۆ زمانی تورکی هاتە ئاراوە. من و هاوڕێیانم سیروان ڕەحیم و ئازاد دلوار نزیکەی ١٥٠ شیعری کورت و درێژی سەردەمە جیاوازەکانی کاک شێرکۆمان بۆ تورکی وەرگێڕا. بەو پێیەی

کاک سیروان ڕەحیم هاوڕێیەکی زۆر نزیکی کاک شێرکۆ بوو و بەیەکێک لە شارەزاترین کەسانی شیعری ئەو دادەنرێت، ئەرکی هەڵبژاردنی ئەو شیعرانەی گرتە ئەستۆ کە دەبوو بۆ تورکی وەریان بگێڕین. پاشان هەر خۆی شیعرەکانی بەسەر هەرسێکماندا دابەش دەکرد. ئێمەیش هەریەکەمان لای خۆمانەوە شیعرەکانمان وەردەگێڕا و هەفتەی جارێکیش کۆ دەبووینەوە و دانە بە دانەی شیعرە وەرگێڕدراوەکانی یەکترمان هەڵدەسەنگاند و پاش ڕازیبوونی هەرسێکمان، بڕیاری دواییمان دەدا و فۆرمی کۆتاییمان پێ دەبەخشی. ئەو شیعرانەی ئێمە وەرمان گێڕاون، گوڵبژێرێکن لە کۆی بەرهەمەکانی کاک شێرکۆ هەر لە دیوانی "تریفەی هەڵبەست"ەوە تا دواین شیعرەکانی ماوەیەکی کورتی پێش چاپکردنی دیوانە تورکییەکەی ئێمە. پاش ئەوەی لە وەرگێڕانی شیعرەکان بووینەوە، بە هەوڵی کاک شێرکۆ خۆی و بە کۆمەکی وەزارەتی ڕۆشنبیریی حکوومەتی کوردستان لە بەهاری ساڵی ٢٠١١دا دیوانەکەمان بە ناونیشانی "بارانی شیعر لە باشوورەوە" لە ئیستانبوڵ چاپ کرد. پاش ماوەیەک لە بڵاوبوونەوەی دیوانەکە، لە میدیای تورکیدا کۆمەڵێک هەواڵ و بابەتی لەسەر نووسرا کە ئێمە بەشێکیمان کۆ کردەوە و بۆ کاک شێرکۆمان نارد. پێشبینی دەکەین لە داهاتوویشدا بابەتی زیاتر لەسەر شیعرەکان بنووسرێت. مانگی ئابی ساڵی ٢٠١١ من و کاک سیروان ڕەحیم لە ئیستانبوڵ سەردانی نووسەری گەورە یەشار کەمالمان کرد. لەو سەردانەدا دوو دیاریمان پێ بوو: دیوانە تورکییەکەی کاک شێرکۆ و چەپکێک گوڵ. یەشار کەمال بانگی خاتوو ئایشە بابانی هاوسەری کرد و داوای لێ کرد چەند شیعرێکی لە دیوانەکە بۆ بخوێنێتەوە. ئەویش دەستی پێکرد. دوای چەند ساتێک یەشار کەمال گوتی: "ئەمە ئەدەبێکی زۆر بەرزە. خۆشحاڵم کورد شاعیری وای هەیە..."

بۆ لەمەودوایش، وەک بەڵێنمان بە کاک شێرکۆ خۆی دابوو، بیر لەوە دەکەینەوە درێژە بەو کارە بدەین و لە هەلێکی گونجاو و لە چوارچێوەی پرۆژەیەکی نوێدا کۆمەڵێک شیعری تری شاعیر بۆ زمانەکانی تورکی و ئەڵمانی وەربگێڕین. هەر کاتێک دەست بدەینە ئەو کارە، من بەباشی دەزانم بەهەمان شێوەی کاری پێشوومان بژاردەیەک لە شیعرەکانی کاک شێرکۆ دەستنیشان بکەین و وەریان بگێڕین.

زۆر برگە و سەردەمەکانی مێژووی ڕابردووی مرۆڤایەتی بەناوی کەسایەتییە ناودار و کاریگەرەکان دەناسرێتەوە. بێگومان لە داهاتووی کوردیشدا ناوی شێرکۆ بێکەس دەبێت بە نیشانەی ناسینەوەی برگەیەکی مێژووی ئەم گەلە. منیش کاتێک بیر دەکەمەوە، هەست بە شانازی دەکەم کە ٤٥ ساڵی تەمەنم لە سەردەمی شێرکۆ بێکەسدا ژیاوم.



شێرکۆ بێکەس　　د. حەسیب شوانی　　بەکر شوانی　　٢٠١٣/٤/٧

# ماڵئاوا میری شیعری کوردیی



مستەفا ساڵح کەریم

مەرگی شێرکۆ بێکەس، ڕووداوێکی ئاسایی نییە، هەروا بە ڕاگوزاری باسی بکرێ، مەرگی ئەو واتە چەندین قەڵەم و چەندەها شووشەی مەرەکەبی سەردەمی لاویی کە بەخەتە خۆشەکەی شیعری بەو پاندانە ئێسکسووکەی دەستی پێ ئەنووسی، ئێستا بێ خاوەن مان، واتە کتێبخانەی کوردیی چیتر باوەش بۆ بەرهەمی نوێی ئەو ناگرێتەوە.

* بەدەگمەن لەم سەردەمەدا، شاعیرێکی وا بەهرەوەر و بە سەلیقە هەڵدەکەوێ، کە بەحەقیقەت کانیاوێکی ڕوون بوو هەمیشە قوڵپی ئەدا. کەم شاعیر هەیە بگاتە ئەو تەمەنە و بەردەوام ڕووباری شیعری وەک ئەو لەجۆش و خرۆشدا بێ و بێدەنگی بەخۆیەوە نەبینێ و ڕایەڵەی شیعری لەنێوان خۆی و خوێنەرانیا ڕۆژ بەدوای ڕۆژدا پتەوتر بێ، شێرکۆ بەو باخە پڕ لە شیعرەی، بەو هەموو وێنە شیعرییە جوانانەوە، بەڕای ڕەخنەگرانی عەرەب و کورد، بەڕاستی بوو بە میری شیعری کوردی لە سەرەتای هەزارەی سێیەمدا.

*چ شەوێک بوو ئەو شەوەی کە لە ناوەڕاستی ئاسمانا ئەستێرەیەکی گەش لەناکاوا گڕی تێبەر بوو. کشا.. کشا تا لەچاو ونبوو، بۆ ڕۆژی دوایی دەمەدەمی عەسر بوو کە

چرای ژینی ئەستێرەیەکی تر لەسەر زەوی کوژایەوە، ئەم ئەستێرەیە شێرکۆ بێکەسی شاعیر بوو، کە نەک ئەستێرە، نەک چرا، بەڵکو بەتەنیا خۆی (چل چرا) بوو، بۆیە هەموو خاوەن قەڵەمێکی ڕەسەن جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە کۆچی ئەم شاعیرە گەورەیە زیانێک بوو بۆ گەلی کورد، بۆ ئەدەبی کوردیی، بۆ کوردستان، کە شاعیرێکی نەتەوەخوازی بلیمەتی وای لەدەست دەچێ، ئەم کۆستە گەورەیە بۆ ئێمەومانانی هاوڕێی شاعیر مانایەکی جیاوازی هەیە، لەو شریتەدا ڕەنگ دەداتەوە کە چەندین ساڵی ڕابردووی هاوبەشمانی تێدا تۆمار کراوە.

* شێرکۆ بێکەسی بەحەق شاعیری گەورەی گەلەکەمان، زۆرترین خوێنەر و بیسەری لەناو سەنگەرەکانا، لەناو پێشمەرگەکانا، لەناو هۆڵەکانا هەبوو، شان بەشانی ئەو هەموو خوێنەرەی لە کۆتایی شەستەکانەوە عاشقی کەژاوەی شیعرەکانی و تریفەی هەڵبەستەکانی بوون، شیعر لای شێرکۆ پەیام بوو، ژیان بوو، ئاڵایەک بوو لە هەموو شوێنێکی کوردستانا بەبەرزی دەشەکایەوە.

* من بەش بەحاڵی خۆم، ٤٥ ساڵە لە نزیکەوە هاوڕێی کاکە شێرکۆم، پڕاوپڕی چەندین دەفتەر یادگاری هاوبەشمان هەیە، لە دەرچوونی یەکەم کۆمەڵە شیعرییەوە «تریفەی هەڵبەست» کە لە کونجی چاپخانەیەکدا لەناو بازاڕی عەسریی ئێستادا پێشکەشی کردم، لەوکاتەوە هاوڕێین، لە ١٩٧٠ تا ١٩٧٤ لە هەموو چالاکییەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورد دا لە سلێمانی، کەرکوک، بەغدا، هەولێر و دهۆک پێکەوە بەشدار بووین.

لەچوونە دەرەوەشمانا لەگەڵ ئەو پۆلە هاوڕێ خاوەن قەڵەمانەدا بۆ ڕیزەکانی شۆڕش کە یەکەم قۆناغمان تەوێڵە بوو، کاک شێرکۆ سەرقافڵەمان بوو، یادگارەکانی شەوانی تەوێڵە و کۆشکی ئاشتی لە چۆمان و خێوەتەکانی بابەکراوا و پاشان خێوەتگەمان لە ئازادی و جارێکی تریش کۆشکی ئاشتی، هەرگیز لەیاد ناچن و هەمیشە لە یادەوەریمانا زیندوون.

* دوای نسکۆی شۆڕش پێکەوە ڕەوانەی پارێزگای ئەنبار کراین، پاش سێ ساڵی مەنفا کە هاتینەوە، هەرپێکەوە لەگەڵ نووسەرانی هاوڕێمانا هەوڵمان دا بۆ بەستنی کۆنگرەی پێنجەم، ئەو کۆنگرەیەی لەو بارودۆخە ناهەموارەدا بەتوندیی بەرانبەر بە بەعس وەستا و پڕ بەدەم وتی: «نا بۆ بەعەرەب کردن، نا بۆ وێرانکردنی کوردستان، نا بۆ بە بەعسی کردن» نا... بۆ سانسۆر لەسەر وشە».

* لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٤ دیسان ئەو پۆلە هاوڕێیەی لێی نزیک بووین، جارێکی تر بەرەو شاخ و بۆلای هاوڕێ پێشمەرگەکانی بەڕێمان کرد، لەوێشەوە لە سەرگەڵوو، بەرگەڵوو، پاشان لە ئیتالیا و. ئەمجا لە شام و دوا مەنزڵیش لە سوید، هەمیشە پەیوەندیمان بەردەوام بوو تا ڕاپەڕین و گەڕانەوەی بۆ کوردستان.

*هەرگیز ئەو ساتەم لە یاد ناچێ کە ئێمە مەستی سەرەنجامی ڕاپەڕینی دووەم بووین. کاک ڕەئووف بێگەرد پێی وتم: خۆت ون مەکە، پێکەوە ئەچین بۆ شوێنێک؟ ئێوارە وەخت بوو، لە مەکتەبەی سلێمانی بووین، ویستی بیکات بە موفاجەئە، بەڵام من زۆرم لێ کرد کە پێم بڵێ، ئەویش بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: «شێرکۆ هاتۆتەوە» ئیتر بە کۆمەڵ چوینە لای و بە دیداری شاد بووین.

* وا جارێکی تر زەنگی مۆبایلەکەم زنجیرەی شریتی یادگارەکانمی ئاڵۆز کرد، دەنگێ لە هۆڵەنداوە بە قوڵپی گریانەوە سۆراخی ئەو هەواڵە پڕ ناسۆرەی دەپرسێ، ئەمڕۆش لای نیوەڕۆ بەلای دەزگای سەردەما تێپەڕیم، مەرگی شێرکۆ وای لێ کردبووم کە«سەردەم» لەجێی جارانی نەبینم.. تۆ بڵێی ڕێم هەڵە نەکردبێ؟ هەر بەو کۆڵەخەمەوە ڕووم کردە پارکی ئازادیی هەستم کرد گوڵەباخەکان یەک بەیەک دەڵێن: چیتر کاکە شێرکۆ دەست ناکاتە ملمان، ئەوە خۆیەتی بە قوڵپی گریانەوە پێمان ئەڵێ: گوڵەباخەکان ماڵئاوا.



# دروود بۆ ڕۆحی ئەو شاعیرەی هەتا مرد سەری لەلووتکەدا بوو!

د.دانا ئەحمەد مستەفا



دەقە مێژووییەکان، بەو دەقە ئاینییانەشەوە، کەسەرگوزشتەی کەڵەپیاوانی ناو مێژوو دەگێڕنەوە و باس لە ڕۆڵی جوامێرییان دەکەن لە ئاراستەکردنی خەڵک و دروستکردنی دەستەبژێر و سەرکردایەتی کردنی نوخبەدا، هەموو ئەو دەقانە پێدادەگرن لەسەر ئەوەی ڕۆڵی ئەو پاڵەوانانە، بەتەنها، وەک رۆڵی بارتەقای میللەتێک وایە!

لەمێژووی ئەدەبی کوردیدا، شێرکۆ بێکەس، ئەو تاکە شاعیرەیە کە خاوەنی زۆرترین دەقی نووسراوە، بەهرەی نووسینی شیعر و بیرۆکەی یاریکردن بەوشە و سیاقی کوردی شیرین لە ئەدگارە جوانەکانی شیعری کاک شێرکۆن، توانستی شیعر نووسینی بەردەوام بەجۆرێک لە دەروونی ئەم زاتەدا رسکابوو کە نەیدەتوانی ساتێک لێی دوور

بکەوێتەوە.. هەمیشە خەیاڵ و دووکەڵی جگەرەکەی دەستی دەبوونە دوو باڵندەی سپی و ناوازە و ئەوەندە بەرزدەبوونەوە تا بەتەواوی لە بۆشایی ئاسماندا ون دەبوون.. هەموو بوونەوەریان دەکردە ئامانج.. لە گیاندار وبێ گیان.. ئافرەت و سروشت.. خەیاڵی بەرزەفڕی کاک شێرکۆ ئەوەندە مەزنە.. ئەوەندە قووڵە.. کە دەستی کەم کەس دەگاتە تێگەیشتنی و پەی بە بەرزی و جوانییەکانی دەبات، دەریاگەردی باش و مەلەوانی چاک دووڕ و گەوهەری لە شیعری ئەم شاعیرە مەزنە دەردەهێنا. مرۆڤ کە دەقەکانی مامۆستا شێرکۆ دەخوێنێتەوە، بێئەوەی ئاگاداری لایەنی هۆشەکی خۆی بێت، ڕادەستی خەیاڵێکی بەرزەفڕ دەبێت، خەیاڵێک دەیباتە ئەوپەڕی جوانی و ترۆپکی وێنەی بەرز و ناوازە و هەستکردن بەجوانییەکانی سروشت و دونیا و خۆشەویستی و چێژ وەرگرتن لە هەموو چەمکەکانی ستاتیکای ژیان و مرۆڤدۆستی..

کەشیعری کاک شێکۆ بێکەس دەخوێنیتەوە، لەسەرەتادا، کۆمەڵێک کۆد دەخاتە ڕوو، کەهەریەکەیان هەڵگری دەیان مەدلولی مرۆیین، بەڵام بەزاراوەی ناسکی شیعریی، لەپاش تەیکردنی گشت لایەنەکانی و فرین بەناو گشت ئاسۆکانیدا، ئینجا هەوڵ دەدات هێدی هێدی کۆدەکان بکاتەوە، و خوێنەر ئەوەندەیتر ئاشقی دەقەکانی خۆی بکات..

لەدەقەکانی کاک شێرکۆدا سەرجەم ئازارەکانی مرۆڤ دەبینین، لە ئازارە دەروونییەکانەوە تا ئازارە جەستەییەکان، لەو ئازارانەی مرۆڤەکان تیایدا بەشدارن تا ئەوانەی تایبەتن بە میللەتەکەی خۆیەوە.. ئەم شاعیرە زیندووە بەردەوام لەگەڵ ئازارەکانی گەلەکەیدا بووە، شیعرەکانی پڕن لە مەینەتییەکانی بەدرێژایی مێژووی ئەم ناوچەیە بەسەر گەلی کورددا هاتووە. ئەوەندە هەستیارە بەرامبەر ئەو نەهامەتییانە، دەبینین زۆرجار پەنادەباتە بەر سروشت و پێکهاتەکانی، شاخ و دەشت و بەردو دار و چیاو دۆڵ و رووباری کوردستان هەموو دەکاتە ڕۆح لەبەر و دەبێتە هاوڕێی و خەمخۆر و سەرقافڵەیان و گیانی پێشمەرگایەتی و فیداکاری دەکاتە بەری هەموویان.

شێرکۆ بێکەس لەقەسیدەدا بۆ شیعر ناگەڕێ.. بەپێچەوانەوە، ئەو سەرەتا قەسیدەکە دەدۆزێتەوە پاشان شیعرەکە دەنووسێت، شاعیرگەلێکی زۆر هەن لە هۆنراوەکانیاندا بۆ شیعر دەگەڕێن، واتە هۆنراوە لەلایان گەڕانە بەدوای هۆنراوەدا. بەو شێوەیە ماوەیەکی زۆر دەگەڕێن و کاغەز و دیوانەکان پڕ دەکەنەوە، بەڵام دواجار لەوانەیە نەیدۆزنەوە، یان لەباشترین حاڵدا هەندێ پارچەی پەرتەوازە لێرەو لەوێ دەدۆزنەوە، یان تەنانەت دەیدۆزنەوە، بەڵام ئەم گەڕانەیان لەشێوەی قەسیدە و دیوانە شیعری تەواودا بڵاودەکەنەوە. بۆیە دەبینین ئەم جۆرەی شیعر کولتوورگەرایی و مەعریفەگەرایی و مێژووگەرایی تیادا تێکەڵ دەبن و زاڵ دەبن. بەڵام جۆری یەکەم کە تیایدا شاعیر لەو ڕاوچییە دەچێ کەسەرەتا خۆی ڕادەچەنێ بۆ نیشانەگرتنەوە لە باڵندەکە و کەبۆی مەیسەر بوو بە ئاسانی ڕووخسارەکەی دەگوازێتەوە بۆ سەر کاغەز... ئەمانە ژمارەیان کەمترە و شیعرەکانیان بەروونی و شەفافییەت و دەرکەوتنی قووڵاییەکان دەناسرێنەوە، چونکە زۆر خۆیان شەکەت و ماندوو ناکەن و زۆر لەخۆیان ناکەن بۆ گواستنەوەی دیدە شیعرییەکە، دوای ڕاوکردنی، بۆ زمان.

بەم جۆرە لەخۆم ڕائەبینم کە دەتوانم بڵێم: شێرکۆ بێکەس یەکێکە لەوانەی سەرەتا سەرقاڵی گەڕانن بەدوای نێچیرەکەیاندا و هەرئەوەندەی گرتیان بەبەژنرێکی و سووکی و بەختەوەرییەوە دەیخەنە سەر کاغەز

لەدەستدانی شاعیرێکی لەو جۆرە، نەک تەنها کەسەرە بۆ کورد، بەڵکو خەسارەتێکی گەورەیە بۆ مرۆڤایەتی بەگشتی. بەڵام ئەوەی هەمیشە کاک شێرکۆ بەنەمری دەهێڵێتەوە دەقە ناوازەکانێتی، ئەوەندە باڵان و پڕ شیعرییەت و بەرزن.. ئەوەندە زمانیان پاراوە و ئەوەندە دەوڵەمەندن بە زاراوەی کوردی شیرین، کەهەریەکەیان ئاماژە بۆ گەورەیی شاعیر دەکەن.



# چەند شیعرێک لە دیوانە شیعری (خێراکە... مردن خەریکە بگات!)ی شێرکۆ بێکەس-ەوە

# دایکم

**دایکم... هەر لەوێیە... دایکم**
**لەوە ئەچێ**
**بووبێ بە کرێچی پاییز.**
**بە شۆڕەبی سەر لەرزۆکی**
**کەنار چۆمێ، لەوێ دایکم.**
**دایکم... هەر لەوێیە دایکم.**
**من ئەزانم ئەمێستاکە**
**لەناو بوولێڵی غوربەتدا**
**بووە بە ئاو،**
**ڕەنگی بێڕەنگیی گرتووە...**
**بۆنی بێبۆنیی گرتووە،**

**"تەنیایی" بووە بە کچی و**
**"نامۆیی" بووە بە کوڕی و**
**تازە نایەتەوە دایکم!**
*****
**وەختێ پیریی بە گۆچانەکەی دەستێوە**
**خاو خاو دێت و وەکو خەونێکی زەردەڵە**
**پەیدا ئەبێ و هەناسەسوار، هەر وەك دایکم،**
**لەسەر سەکۆیەکی پاییز دائەنیشێ،**
**تەزبیحەکەی لە باخەڵی سوخمەی مۆری**
**دەرئەهێنێ و چاو ئەبڕێتە گەڵای بەر پێ.**
**لەو ساتەدا هەوای وەشتێ، بۆن و بەرامەی**
**یادگار، لە بیرەوەری دوورەوە، زۆر دوورەوە،**
**بۆ ئەو دێنێ. بە بێ ئەوەی پێبزانێ،**

**زەردەخەنەیەك ئەیگرێ و، بە بێ ئەوەی پێبزانێ،**

چەند دڵۆپێکی سەرگەردان دێنە خوارێ و
خەو تەڕ ئەبێ،
ئەو هەڵناسێ،
تا ئەو کاتەی زەردەپەڕی دەستە خوشکی
دەستێ ئەخاتە سەر شانی و تا ئەو ساتەی،
بە برووسکەی پەڵە هەورێ، هەڕەشەکەر،
دائەچڵەکێ!

سلێمانی- کۆتایی مایسی ٢٠١١



## گۆرانیی

ئەو باخە دەنگی زۆر خۆشە
بەتایبەتی وەختێ گۆرانیی بۆ خەمی
پاییز ئەڵێ،
ئەو ئاوە دەنگی زۆر خۆشە
بەتایبەتی وەختێ گۆرانیی بۆ گوڵی
کەنار ئەڵێ،
ئەو مەلە دەنگی زۆر خۆشە
بەتایبەتی وەختێ گۆرانیی بۆ کۆچی
سووری ئەڵێ،
بەڵام لە هەموو، هەر هەموو، زۆر دەنگ خۆشتر،
ئەو کچەیە،
بەتایبەتی گۆرانیی بۆ کوڕی خەون و
سووتانی عەشقی خۆی ئەڵێ!

پاییزی ٢٠١١



# گلەیی

لەبەر تەنیاییەکەی دایکم،
ساڵی پار سەرم نەپەرژا
شیعرێ بۆ پاییز بنووسم،
جارێکیشیان بە کزەبای سەر گۆیژەدا
ئەو پەپوولەی گلەییانەی
بۆ ناردبووم!

بۆیە ئەمساڵ

لەگەڵ یەکەم پەڵە هەوری داکردنیا،

وەکو چەتر و مشەماکەم ئامادەبووم.

کە لەو بنارەدا بینیم،

قەسیدەیەکم دایە دەست
درێژ... درێژ
وەك گێژەڵووکەی پێدەشت و
تەڕ تەڕ وەکو چاوی دایکم،
چون دڵی بێوەژنانی گەرمیانیش
پڕ لە حەسرەت!
ئیتر پاییز قسەی نەکرد
چاوم لێبوو... قوڕگی پڕبووبوو لە گریان
بە سەر سوپاسی کردم و
ڕووی کردە دووره شاخان و

منی بە تەنها بەجێهێشت!

سلێمانی ٢٠١٢/١٢/٢٥

# فورات

له کۆچێکدا که ڕەشەبا

گڤەیەکی جگەرگۆشەی لێ بەجێما،

ئیتر تا مرد

ئەو حەسرەتە لە دڵ و چاویا دەرنەچوو!

لە میحنەتی شەوێکیشدا، تیترواسکێ

لەو دوو هێلکەیەی کردبووی،

کە یەکێکیانی لە کەنار

گۆمیلکەکەدا بەجێهێشت،

لەدواییدا و لە بەرزترین فڕیندا،

ئەو چاوێکی هەر لەسەر ئەو گۆماوەبوو.

ئەوکاتەی منیش لە کۆچدا و

لەسەر فورات،

قەسیدەیەکم ئاو بردی،

هەتا ئێستەیش نەك هەر فورات،

لە دنیادا هەرچی ڕووبارێ ببینم،

وائەزانم شیعرەکەمی لەناودایە و

چاوێکم هەروا لەسەری!

سلێمانی ٢٠١٢/١٢/٣٠



# داڕزان

لە بێشەی ئەم نەخشەیەدا...
لەسەر دەرگای حەوشەی گورگ و
لەسەر دیواری دەرەوەی
ماڵی هەموو یەکانەکان...
لەسەر پشتی کەرکەدەن و
لەسەر تەوێڵی تیمساح و
لەسەر کەپوی چەقەڵەکان،
بە گەورەیی بە قاوەیی،
لێیان نووسراوە: ئازادی!
لە بێشەی ئەم وڵاتەدا،
لەسەر یەك بە یەکی قوللەی
قەڵای هەموو دڕندەکان،
لەسەر گەردنی نەهەنگ و
لەسەر خورتومی فیلەکان،
بە گەورەیی و بە نارنجیی
هەر هەموو لێیان نووسراوە:
دیموکراسی!




لەم جەنگەڵی مێژووەدا
لەسەر قنگی سووری مەیموون،
لەسەر قەپۆزی گەماڵ و
لەسەر کەفەڵی ورچەکان،
بە گەورەیی و
خەتی سپی،
هەر هەموو لێیان نووسراوە:
دادپەروەریی!
بەڵام هەموو بەیانییەك، ئێمە

لەبەر دەرگای ماڵەوەدا و
لە سەرەڕێی هاتووچۆدا،
کە ئازادیمان تووش ئەبێ،
ئەڵێی کەڵەشێری شەلەو،
دەنگ نووساوە!
کە دیموکراسیمان تووش ئەبێ،
ئەڵێی مامزی ترساوە و،
دەم بەستراوە!
کە دادپەروەریش ئەبینین،
هەر پەڕ و ئێسکێکی ڕووتە و
بە چوار لادا،
"با" ئەیانبا و
جەستەیش لە شەودا خوراوە!

سلێمانی ٢٠٠٩ - ٢٠١١








# ئاهەنگی گەنم

**دڵشاد عەبدوڵڵا**

کورتە نامەکە دەڵێ:
(( ئامادەبە لەئاهەنگی تاج لەسەرنانی ( شێرکۆ بێکەس) دا))
بلیتی فڕۆکە دەکڕم
لەیۆنانەوە یەکسەر بۆ سلێمانی
کەدەگەم، هەموو شاعیرەکان لەوێن
خوێنی نەمری دەگەڕێ.
ئیلیادە پێشم کەوتووە
هەرتاشەبەردێکی وڵاتی (شێرکۆ) تەروادەیەکە!

پەنجەرەی ماڵەکان بەزەحمەت هەناسەدەدەن!
ڕەشەبا بەناوبانگەکە دەنگی نووساوە، بەڕیشاڵی سیبەکانی ئەوگردو سنەوبەرانەوە
کەلەدەوری شارن، بەزەحمەت هەناسەدەدا
بەزەحمەت هەناسە دەدەن باخچەکانیش!

کەدەگەمە ناوئاهەنگگێڕان!
ئامادەبووان بەپیرمەوە دێن
بابەهۆمیرۆس گەیشت!

ئاهەنگەکە! بەشیعرێکی حاجی دەست پێدەکا:
(( ئێمەش دەمرین دەبینە خاکی سەرە ڕێ ))
وشەی دەمرین مەجازە بۆژیانێکی ئەبەدی.
خوای شیعر لەئۆڵمپەوە دەگاتە پیرەمەگروون
بەکەژاوەیەکی زیوین دێتە ناوشار
خۆرێکی گرتووە بەهەردووەدەستی
کەدەگا،
( شێرکۆ ) کەمێك دەچەمێتەوە
خواش تاجەکە دادەنێ و، نەخبی شیعر دەخوێنێتەوە.

# پەیام و پۆستەرە شیعرێکی دلاوەر قەرەداغی بۆ شێرکۆ بێکەس

ماڵئاوا کاک شێرکۆ … سوپاس بۆ شیعرەکانت … سوپاس بۆ کتێبە جوانەکانت … سوپاس بۆ زمانە جوانە کوردییەکەت … کە وشەت بە باران و هەتاو و تریفە دەگرتەوە و لە شیعردا دەتکردە ئێکسیری داهێنان و زیندەگی … سوپاس کاک شێرکۆ بۆ ئامادەبوونی هەمیشەییت لە ئێوارەکۆڕەکانمانا … سوپاس بۆ هەبوونت لەگەڵماندا لەو جێگایانەدا کە وەک شاعیرێک گرینگ بوو بە لاتەوە لەوێ بیت … سوپاس بۆ ئەو ئیمزایانەی کە لە پای بەیاننامەکانی ناڕەزایەتیدا دەتکردن، سوپاس بۆ ئەو نا بەرزانەی کە لەگەڵ هاوارەکانی تووڕە بوونماندا دەتگوتن … سوپاس بۆ ئەو سەرنج و ڕەخنە و ئافەرینانەی کە ڕاشکاوانە دەتدا لە یەخەی شیعر و نووسینمان… سوپاس کاک شێرکۆ بۆ هەموو شت…. سوپاس بۆ ئەو هەموو کتێبە جوانانەی کە بۆت جێهێشتین و بەردەوام مانا دەدەنە ژیان و مانەوە و نائومێدنەبوون و بەردەوامیمان … سوپاس بۆ تۆ کە لە دوورترین شوێنیش بووینایە هەستمان دەکرد هەر نزیکمانیت و لەگەڵمانیت و لە سەرمان دەکەیتەوە و بەرگریمان لێ دەکەیت … سوپاس بۆ دڵی پڕ لە منالّییت کاک شێرکۆ… سوپاس بۆ کتێبەکانت … سوپاس بۆ ئەو کاغەزانەش کە هێشتا هیچت لەسەر نەنووسیون، سوپاس بۆ قەڵەم ڕەساس و لاستیکی خەت کوژانەوەکەت … سوپاس کە بەو هەموو نەخۆشیی و شەکەتییەتەوە، هێشتا دڵت نایە بە جێمان بهێڵیت، بەڵکو لێرە هەمیشە لەناو کتێب و لە ماڵی جوانییەکان و لەبەر پەنجەرەکانی ڕوانین و لەبەردەرگاکانی سەفەردا لەگەڵمانیت … سوپاس کاک شێرکۆ …. زۆر زۆر سوپاس .

**با و باران و کۆتر و**
**گوڵ و بەرد**
**بیریان دەکرد**
**تەگبیریان کرد**
**ئێوارەیەك بچنە لای و**
**دیدەنیی ماڵی شیعری بکەن**
**کاتێ گەیشتنە بەر دەرگا**
**وەکوو جاران دڵیان نەهات**
**دەقی بێدەنگیی بشکێنن،**
**بیکەنە هەرا و هاتوبات**
**ئەمجارەیان بزێو… بزێو**
**پەنجەیان نایە سەر زاری یەکتر و**
**چپەچپ بە یەکدییان دەگوت:**
**کچێ لەوێ… ئاقڵ و بێدەنگ و**
**سەلار دانیشن!**
**کاتێ چوونە ژوورەوە…**
**باران لە دڵی خۆیدا**
**نمەنمە دایکرد**
**کۆتر… سپی سپی سپی**
**وەك چۆڕی شیر**
**کەوتە گمە**
**گوڵ بە زوبانی عەتر پشکوت و**
**با، بە خەیاڵ بە ژوورەکەدا هەڵی کرد**
**بەرد لارەمل… چاو بە فرمێسك**
**دانەوییەوە**
**پەڕەیەك نێرگزی لە گیرفانی**
**بەرباخەڵەکەیدا دەرهێنا**
**چووە سەر تاقێکی بەرز و**
**بە دەم چەپڵەی ئافەرینی**
**با و باران و گوڵ و کۆترەوە**
**بە ئیشارەت**
**حیلەیەك لە ئەسپێك هەلاڵەی**
**بۆ ئامادەبووان خوێندەوە!**



# تۆ وەرەوە بۆ سلێمانی



## کەریم دەشتی

ئازیز شێرکۆ، برام شێرکۆ، دڵم شێرکۆ
وەرەوە بۆ سلێمانی، تۆ وەرەوە سلێمانی
جارێکی دیش زەردەپەڕی ئەم شارەمان
بۆبکەوە بە شیعری تەڕ
بە موزیکی نەقشی مانی
ئازیز شێرکۆ، برام شێرکۆ ، دڵم شێرکۆ
وەرە هەولێر،
تۆ لەم غوربەتە چدەکەی؟
وەرەوە تا هەر وەکو جاران دەست لە ملی قەڵا بکەی
جارێکی دی باسی عبدولخالق بکەی
وەرەوە بۆ ناو جەزیرە شاری خانی
کە تا ئێستاش بۆنی زین و مەمی لێدێ
وەرەوە دەی ، وەرەوە بۆ شاری کۆیە
حاجی هەروا شین دەگێڕێ و چاوەڕێیە
خێراکە بۆ کەرکوك وەرە، کەرکوك دەگری
بابە گوڕ گوڕ چاو لە ڕێیە
وەرەوە بچینە مەهاباد، چوارچرا بەسەرکەینەوە
شەو بچینە شاری بۆکان
لەوێ کچان
بۆ شیعری جوان دێنە چۆکان
لەوێ بە پشتی شیعرێکی تەڕو پاراو
دەچینەوە شاری دەرسیم
کە شارێکە لە زەڕو سیم
شارێ کە لەوەتەی هەیە دەگری بۆ ئازادی و هەتاو
لەوێ بە سواری پاسەکان دەچینە سەر گۆڕی نالی
کە تا ئێستاش ئالی بابان دەری کردو بۆی دەناڵی
کاکە شێرکۆ لەوێ دەچینە قامیشلو، قامیشلۆی ئاو
گۆرانییەکەی کاکە شێخۆ دەڵێینەوە
تا تێر دەبین لە ئەشکی چاو
دیسان لەوێ دێینەوە بۆ سلێمانی
شاری شیعرو شاری بەستەو شاری جوانی
شاری هەڵمەت و قوربانی
شارێ قەدری تۆی نەزانی
ئەوسا هەرچی دەبێ ببێ تۆ لە غەریبی وەرەوە

# کورتە شیعرێکی بڵاونەکراوەی شێرکۆ بێکەس

## ئەو وەختەی بووم بە بۆکانی.!

**شێرکۆ بێکەس**



**تەنها جارێك بە (بۆکان)دا**
**تێپەڕی بووم**
**بۆیە لە خەیاڵما ئەویش**
**لە سێبەری باخچەیەکی ماندوو زیاتر**
**چیتر نەبوو.!**
**کەچی ئەمڕۆ**
**کە ئەو ژنە جوانە بۆکانییەم ناسی**
**وەکو ئاسمان چاویم ناسی**
**وەکو کانی دەمیم ناسی**
**وەکو خەون.. ڕۆحیم ناسی**
**قژیم ئاڵاند لە گەردنی هەڵبەستمەوە**
**ئیتر ئەوسا**
**هەردووکمان بووین**
**بە پەڕوو باڵی یەك باڵندەی**
**کۆچەکانی خۆشەویستی و تا تخووبی**
**لای خوا فڕین**
**ئیتر هەر نەك شیعرەکانم**
**ژوورەکەم و چرپاکەم و سەرینەکەم**
**قەڵەمەکەم و چاویلکەکەم...لە دەرەوەش**
**شاخی گۆیژە و شەقامی سالم و گۆران**
**ئەوانیش بوون بە بۆکانی**
**من لەمڕۆوە**
**وا هەست دەکەم**
**خەڵکی سلێمانی نیم و**
**عەشقی ئەو ژنە بردوومی هەتا سەر ناڵە شکێنێ و**
**بە ئێجگاری**
**بۆخۆشم بووم**
**بە بولبولێکی بۆکانی.!**



**١٠-٧-٢٠١٢**

***ئەم شیعرەی بۆ کیژێکی بۆکانی وتووەو**
**بۆ یەکەمجار بڵاودەبێتەوە**

# کەرکوک لە شیعری شێرکۆدا

## دوا دیوانی وەک نمونە



لەتیف فاتیح فەرەج

کەس نکوڵی لەوە نییە، کە شێرکۆ بێکەس هەرە ناسراوترین شاعیری چەندین دەیەی کوردە، شێرکۆ بێکەس لە دیوانی یەکەمیەوە « تریفەی هەڵبەست» تا دوا دیوانی « خێراکە... مردن خەریکە بگات!» بە بەردەوامی بۆ ماوەی ٣٥ ساڵ ئیشێکی زۆری لەسەر زمان و کورد و کوردستان کردووە، لە کۆی شیعرەکانیدا بوون بەستراوە بە کورد و کوردستان و شار و شارۆچکە و پێشمەرگەوە ، زۆر جار مرۆڤ کە بەدیار شیعرەکانی شێرکۆوە هەڵوەستە دەکات، دەگاتە ئەو باوەڕەی ئەگەر « کورد، کوردستان، پێشمەرگە، کەرکوک، گەرمیان، ئازادی، شاخ»و دەیان وشەگەلی دیکە کە تایبەتن بە کورد و نەتەوەی کوردەوە، لە دیوانەکانی دەربکرێنە دەرەوە، شێرکۆ زۆر کەمی بۆ دەمێنێتەوە، ئەگەر نەڵێین هیچی وای بۆ نامێنێتەوە، شێرکۆ بێکەس خاوەنێکی بێوێنەی ئەو پرسانەیە، ئەمەش زۆر زیاتر قووڵبوونەوەی شێرکۆ بە دنیای کورد بووندا دەگەیەنێ، شێرکۆ بێکەسی شاعیر، یەکێکە لە پایە گرنگەکانی کورد بوونی ئێمە، لە دوای بزوتنەوە چەکداریەکەی ساڵی ١٩٦١ ئەدەبی کوردی بە گشتی و شیعری کوردی بەتایبەتی لە کوردستانی باشوور ئەرکێکی قورسی کەوتە سەر، ئەرکی پاراستنی زمان و ناسنامە، هەر ئەوەی کە شاعیرانی پێش ئەو مێژووەش بە جۆرێ لە جۆرەکان قوربانی زۆریان لە پێناویا داوە، نمونەی نالی کە بەردەوام لە شیعرەکانیدا داکۆکی لە پاراستنی زمان و تەنانەت یەکگرتنەوەشی دەکات، بۆ نمونە ئەو بۆ « من ، ئەز» بەکار دێنێ، یان لە داکۆکیکردن لە زماندا دەفەرموێ:

**کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کردیە خۆ کوردیە**
**هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنا دەکا**

یان:

**فارس و کورد و عەرەبم هەر سێ بە دەفتەر گرتووە**
**حاکمی سێ مولکە نالی ئەمڕۆ دیوانی هەیە**

ئەمە هەڵبەت بۆ شاعیرانی دیکەش هەروایە، لە کۆتایی شەستەکاندا چەند ناوێکی دیکە هاتنە دەرکەوتن، ئەوانیش هەریەک لە شێرکۆ بێکەس، لەتیف هەڵمەت، عەبدوڵڵا پەشێون.

شێرکۆ بێکەس وەک شاعیرێکی نەتەوەیی هەڵوەستەی زۆری لەسەر کەرکوک کردووە، ئێمە بۆ نووسینی ئەم بابەتە تەنیا دوا دیوانیمان وەک نمونە وەرگرتووە، دیوانی «خێراکە... مردن خەریکە بگات!» ، کە بۆخۆی ناونیشانی دیوانەکەش پێشبینییەکی زۆر شاعیرانەی شێرکۆ بێکەسە بۆ گەیشتنی مردن.

شێرکۆ لەم دیوانەیدا لە شەش شیعرا ناوی کەرکوک دێنێت و شیعرێکی تایبەتیشی بۆ کەرکوک نووسیوە، بەم جۆرەی خوارەوە:

١- شیعری مەحاڵەکان، لاپەڕە ٥٢

٢- شیعری سوپاسنامە، لاپەڕە ٦٤

٣- ئاپۆرەی تورە، لاپەڕە ١١٨

٤- بوومەلەرزە، لاپەڕە ١٦٧

٥- پەروانە، لاپەڕە ١٧٤، ئەم شیعرەی تایبەت بۆ کەرکوک و دیارە بە نیازی گۆرانی نووسیوە، بۆ

خۆیشی نووسیویەتی شیعری گۆرانی

٦- ئەوەی بۆ خوایە و ئەوەی بۆ خەڵکە، لاپەڕە ١٩٠

٧- لە غەزا گەورەکەدا، لاپەڕە ٢٤٢

ئەوەندە بەسە بۆ ئەوەی بڵێین، کەرکوک چ جێگایەکی لە دڵ و دیوانی شێرکۆدا گرتووە، لە شیعری مەحاڵەکاندا « ل ٤١ تا ٥٣»دوا کۆپلەی شیعرەکە دەڵێت:

**لە دواییشدا شیعرێکی کەرکوکیی وتی:**
**ئەوەیشیان هەر خەون نییە**
**ئەم « کوردستان» و « عێراق» ە**
**هەتا گەڕانەوەی « مەهدی»**
**لە چوارچێوەی مووزەوەری**
**ئەم دەوڵەتە درۆزن و**
**جامبازەدا**
**چون وەردییان و زیندانیی**
**لە پاڵ یەکدا بمێننەوە و**
**ڕۆژێك نەیەت**
**« کە هەر ئەبێ ئەو ڕۆژە بێت»**
**دوای تەلاقێکی ئەبەدیی**
**وەك تەلاقی**
**نێوان قەفەز و ئازادیی**
**لە یەکتری**
**جویێ ببنەوە!!**



ئەم شیعرە لە سەرەتای مانگی دوازدەی ساڵی ٢٠١٢ نووسراوە.

شێرکۆ لەم شیعرەدا بە ڕوون و ڕەوانی پێمان ئەڵێت، مەحاڵە تا دنیا دنیایە ئەم کوردستان و عێراقە پێکەوەبن، ڕۆژێک هەردێ جیا ببنەوە. ئەوەش بە زمانی شیعرێکی کەرکوکییەوە دەڵێت، کەواتە جیابوونەوەکەش بێ کەرکوک دەچێتە چوارچێوەی مەحاڵەوە، واتە مادام شیعرێکی کەرکوکی ئەوە دەڵێت، جیابوونەوەکە بە کەرکوکەوەیە.

شیعری دووەم (( سوپاسنامە)) لاپەڕە « ٥٧ تا ٧٠» لەو شیعرەدا کە سوپاسی هەموو ئەوانە دەکات باربوو بۆ کوردانی ڕۆژئاوا کۆدەکەنەوە، لە لاپەڕە ٦٤ دا دەڵێت:

**باربوویان کۆ ئەکردەوە**
**ژیانیان کۆ ئەکردەوە**
**گەرمایان کۆ ئەکردەوە**
**خۆشەویستیان ئەپێچا**
**لە غوربەت و لە عەشقەوە**
**دڵی سلێمانیان ئەخستە ناو دەروونی**
**کەرکوکەوە و چاوی کەرکوکیان ئەخستە**
**ناو بینینی «عامودا»وە و هتد**

شیعری سێیەم، ئاپۆرەی تورە، خۆی ئەم شیعرەی ناوناوە شیعری جەماوەری، لاپەڕە (( ١١٣بۆ ١٢٢)) لە لاپەڕە ١١٨ دا دەڵێت:

**لەیەك کاتدا**
**سەرم سەری کرماشانە و**
**شان و ملم، شان و ملی « قامیشلو» وە و**
**لە یەك کاتدا**
**« ئامەد» سنگمەو**
**«کەرکوك» دڵمە و**
**« گەرمێن» قاچمە و**
**« سلێمانی» یش چاوەکانمە**
**ئەز وا هاتووم**
**من نسێ و ئێوە هەتاون**
**هەر ئەمڕۆش بووم بە کڵپەیەکی کەرکوك و**
**حیلەی ئەسپی مامە ڕیشەم لەناو باهۆزێکی**
**سووردا بۆ هێناون**

شیعری چوارەم « بومەلەرزە»

ئەم شیعرەی بۆ کارەساتە سروشتیەکەی وان وتوە، هەرلەسەرەتادا بەناوی ژنێکی کەرکوکییەوە قسە دەکات:

**ژنێکی کەرکوکی ئەیووت:**
**وای خودایە ... لەو باکوورە**
**لەوێ بچینەوە بە گژ**
**چەند دارستانی قەمە و چەند**
**جەنەراڵی کارەسات و مەرگا لەوێ؟!**
**منداڵێکی «وان» یش ئەیووت**
**ئای خودایە**
**ئێمە قەت نەمان ئەزانی و**
**خەیاڵیش هەر نەیئەزانی**
**ڕۆژێك ئەبێ**
**لەیەك کاتا لە سەرەوە ئەوان**
**بە سواری زرێپۆش دێن و**
**لە ژێرەوەیش**
**تۆ بە سواری بوومەلەرزە**

شێرکۆ بێکەس شیعری پەروانەی بەتایبەت بۆ کەرکوک نووسیوە، ناویشی ناوە شیعری گۆرانی، مێژووی نووسینی ئەم شیعرە ١٧- ٩- ٢٠١٢یە، بەمەش ئەوە دەردەکەوێت کە شێرکۆ بێکەس هەرگیز بۆ یەکساتیش لە ژیانی خۆیدا دەسبەرداری



کوردستانیبوونی کەرکوک نەبووە، شێرکۆ بێکەس لەم شیعرەدا دەڵێت:

**حیکایەتی جانانەیە**
**وەختێ کە شەم ببێ بە زام**
**زام بە شار و**
**شار کەرکوك و**
**ئەوسا ئیتر**
**ئازار بە دەوری کەرکوکدا**
**پەروانەیە**
**حیکایەتی جانانەیە**

ئەم وێنەیە یەکجار و قووڵ و شاعیرانەیە، ئاخر ئازاری شاعیر بە دەوری کەرکوکدا وەک پەروانە دێت و دەچێت و کەرکوکیش شەمەکەیە، چراکە کەرکوک و ئازارە نەبڕاوەکەش کە ئازاری هەموو کوردێکە پەروانەیە.

**ئەوەتەی ئەم عەشقە هەیە**
**زێڕی ڕەش ئەدا بە دونیا و**
**چرا ئەبەخشێ بە دەرێ و**
**کەچی بۆ خۆی ناوی شەوە و**
**ناونیشانی تاریکییە**
**ئەوەتەی ئەم عەشقە هەیە**
**ڕێبوارێکی ڕەش و ڕووتی**
**ناو هەژاری و ئەشکەنجەیە**

ئەوە کەرکوکە هەموو دنیا بە بۆنی نەوتەکەی کەوتووە و ڕووناکی بۆ دنیا ئەنێرێ و هێشتا خۆی لە کوێرەوەری و تاریکیدا دەژێت.

**خەم کەرکوکە و کەرکوك خەمە**
**بەڵام خەمێ، گوڵ دەرئەکا و**
**خەمێ کە سەر نەوی ناکا**
**بۆ ڕەشەبا و لە دنیای ڕق و کینەدا**
**شەقام شەقام**
**خۆشەویستی بەرپا ئەکا**

*

**تۆ کەرکوکیت**
**پێناسەت ئاگرە و برین**
**لە ئاگردا قەقنەسیت و**
**لە بریندا پێکەنینی**
**باخچەی ئەوین**
**تۆ کەرکوکیت هەموو جارێ**
**لە خۆڵەمێشی خۆتەوە تۆ دێیتەوە و**
**ئەبیتەوە بە باڵندەی باڵ برینی**
**سەر ئازادی و ناو ڕاپەڕین**
**داستانێکی سەدەی نوێیە**
**ئەوەی تۆ دیت**
**هێندە بەسە کە کەرکوکیت**

شیعرێکی شۆڕشگێڕانە و پڕ لە بەرگری و مانەوە و بەردەوامییە، شێرکۆ بە بەردەوامی نەیتوانیوە خۆی لە شیعری شۆڕشگێڕانە دابڕێ، هەمیشە بەو شێوازە شیعری نووسیوە،

لەو شیعرەشدا کە بە ناوی «ئەوەی بۆ خودایە و ئەوەی بۆ خاکە» نووسیویەتی، لاپەڕە (( ١٨٣تا ١٩٣))

بە دەم ئازاری پیرەمێردێکی ئەنفالزەدەو بەردەمی ئەژدیهای تەعریب و تەبعیس و ڕاگواستنەوە دەڵێت:

**پیرەمێردێکی « کەرکوك» یش**
**سنگی خستۆتە سەر کەمەی گۆچانەکەی**
**ڕوو لە بەغدا ڕاوەستاوە و**
**لە ورتە ورتێکدا ئەڵێ:**
**ئێمە ئەم قیامەتە کوردییەی ئێرە و**
**جەهەننەمی ئەم دنیایە، لە یاد ناکەین،**
**خودایش بۆ خۆی**
**قرچە قرچی، قیژەی خاك و**
**ئەو سووتان و ئەو دووکەڵەی مێژووی ئێمەی لە**
**چاودایە و**
**چاومان لێیە فرمێسکی نوور، هەموو جارێ**
**لەو بەرزەوە دائەڕێژێ و دوایی نایە!**

لە شیعری لە غەزا گەورەکەشدا دیسان باسی مەینەتیەکانی کورد دەکات و بەوپەڕی توڕەییەوە دەڕوانێتە ئەو مێژووە خوێناوییەی ئێمە بە دەستی عەرەبەوە و باسی بردن و تاڵانی کچ و ژنی کورد دەکات، کە سەرێکی ئەو تاڵانە لە ناوبرینی هەورامان و سەرەکەی دیکەی لەناو قەڵای کەرکوکدا بووە.

لە ڕاستیدا، ئەم کورتە نووسینە وەک وەفایەک بۆ ئەو پیاوە نووسراوە، کە هەمیشە دڵی لای کەرکوک بوو، هەر جار کە دەمبینی ئەو هەواڵی کەرکوکی دەپرسی، هێندەش بە وەفا بوو بۆ کەرکوکیەکان کە هەموو ئەوانەی بە شیعر دەلاواندەوە کە خۆشی دەویستن، لە مامە ڕیشەوە تا ئازاد هەورامی و لە گیتارەکەی ئازادەوە تا قەڵەمەکەی سۆرانی مامە حەمە.

# شێرکۆ بێکەس بە زمانی عەرەبی

شێرکۆ بێکەس یەکێك بوو لەو شاعیرە کوردانەی کە زۆرترین بەرهەمی وەرگێڕاوە بۆ زمانەکانی تر، بەتایبەتیش عەرەبی، بۆیە بە چاکمان زانی بۆ ڕۆڤاری ئەم جارە چەند بابەتێك بە زمانی عەرەبی و چەند شیعرێکی وەرگێڕاوی لەم ڕۆڤارەدا بڵاوبکەینەوە، شیعرەکان (د.نەوزاد ئەسوەد)کردوونی بە عەرەبی، ئەمە جگە لە دیمانەیەکی سامی داود کە بە زمانی عەرەبی لەگەڵیدا سازیداوەو دواهەمین دیمانەی شێرکۆ بێکەس بووە لە ژیاندا، نووسینێکی کورتی زوهدی داودی و پەیڤێکی سەلیم بەرەکات بۆ کۆچی دوای شێرکۆ بێکەسمان هەڵبژارد و لەم بەشەدا بڵاومان کردەوە.

ڕۆڤار

# شيركو بيكه س باللغة العربية

د.نوزاد احمد اسود

اتذكر انني قرأت لأول مرة قصائد شيركو بيكه س مترجمة الى اللغة العربية سنة ١٩٨٨ او ١٩٨٩، عندما ترجمتْ مختارات من قصائده وطبعتْ في دمشق بعنوان (مرايا صغيرة)، وصلتنا هذه المجموعة سراً، اذ كنا نقرأ ونتبادل قصائده بين الاصدقاء، سواء قصائده المكتوبة باللغة الكردية او المترجمة الى العربية بشكل غير علني، ذلك لان النظام البعثي قد منع قصائد شيركو آنذاك اذ ادرجها ضمن خانة المحظورات، كذلك نقل الى العربية بعض من اشعاره نشرت في مجلة (الكرمل) التي كان يترأس تحريرها الشاعر محمود درويش، توالت فيما بعد ترجمات مختلفة لقصائده، ولاسيما بعد انتفاضة ١٩٩١، نذكر منها على سبيل المثال:

اختار طلعت الشايب مجموعة من قصائده المترجمة وقدم لها بعنوان (قصائد لاتنسى الفقراء) ونشرها في العدد ١١٦ من مجلة (ادب ونقد) المصرية في ابريل ١٩٩٥.

رائعته الثمينة (مضيق الفراشات) التي ترجمها آزاد البرزنجي، طبعت في اشهر الدور العربية للطباعة والنشر وهي دار الرازي ببيروت سنة ١٩٩٦ والتي اظن انها اول عمل كردي مترجم تم طبعه في هذه الدار المرموقة، كان لهذه الرائعة صدى واسعا لدى القراء العرب والنقاد على نحو خاص، اذ كتبتْ عنها دراسات نقدية عديدة. وفيما بعد ترجم ازاد برزنجي قصيدته الطويلة (سفر الروائح) سنة ٢٠٠٠، وفي سنة ١٩٩٩ تم طبع مختارات من شعره المترجمة من قبل نخبة من المترجمين الكرد بعنوان (نغمة حجرية) في دار الاهالي للنشر والتوزيع بدمشق.

صدر عن دار الاداب للنشر و التوزيع سنة ٢٠٠٢ نص (إناء الالوان) من ترجمة و تقديم الدكتور شاهو سعيد، يذكر انه لأول مرة يصدر عن هذه الدار العريقة مطبوع كردي, و هذا يدل على مدى اهمية شعر شيركو بيكس لدى القراء العرب، وغير المترجم عنوان القصيدة من إناء الالوان الى (دورق الالوان) في طبعتها الثانية سنة ٢٠٠٩.

في سنة ٢٠٠٣ تمت ترجمة (انشودتان جبليتان) من قبل فؤاد عبدالرحمن، وفي سنة ٢٠٠٤ تمت ترجمة (انت سحابة..فأمطرك) من قبل دانا احمد. الترجمتان طبعتا في السليمانية. في ٢٠٠٩ ترجم هيوا عزيز قصيدته الطويلة (القلادة)، راجعها محيي الدين زنكنه، طبعت بدار الجمل في بيروت وبغداد سنة ٢٠٠٩. وفي السنة نفسها تمت ترجمة قصيدته الطويلة (الكرسي) من قبل هيوا عزيز راجعها وقدم لها الدكتور شاهو سعيد، ومن ثم ترجمها سامي داوود، والترجمتان طبعتا طبعتين مختلفتين في السليمانية.

اختار الكاتب الراحل صلاح برواري مجموعة من قصائده وترجمها بعنوان (ملك الكلمات)، طبعها في دار الينابيع بدمشق سنة ٢٠٠٨. وفي سنة ٢٠١٠ تم طبع كتاب (انبهارات) في القاهرة ضمن مشروع المركز القومي للترجمة، وهي مجموعة مختارة من قصائده المترجمة من قبل نخبة من المترجمين لكرد. اما انا فقمتُ بترجمة مجموعة من قصائده ونشرتها في كتابي (نصوص كردية حديثة)، وفي نيتي طبع كتاب (سبعون نافذة متجولة) قريبا.

اليكم بعضا من قصائده المترجمة الى اللغة العربية من قبلي:

# العراق

في كل صباح
يقتلون جوادا من جياد "جواد سليم"
في كل ظهيرة
يقتلون حمامة من حمامات "فائق حسن"
في كل عصر
يقتلون وترا من أوتار صوت "محمد القبانجي"
وفي كل مساء
يقتلون كأسا من كؤوس "أبونواس"
وما يتبقى من الليل
في هذا البلد
فقط يكتفي:
لدفن الصهيل
ولدفن الهديل
ولدفن المقامات
ولدفن العشق!

# جليل القيسي

مثل ريشة حمامة بيضاء في مهب الريح
كان ابطأ وابسط من تلك الريشة،
جليل القيسي،
كان غارقا في مياه الكتب،
ثلجا اثناء السقوط
كلمة اثناء النحيب
خياله اجمل من الليلة المقمرة.
جليل القيسي
كان مزمارا بيد "القلعة"
حبا ممزوجا من الغسق والخريف
قصة طويل القامة، مجهدة وجائعة
كان اكثر تعاسة من "كركوك"
لكنه لم يترك ولو لحظة
لم يترك الى النهاية، تلك التعاسة،
جليل القيسي!

في "القرنة"
حينما تلتقيان كل يوم
تلتفت دجلة الى الفرات
او تقول فرات لدجلة:
كنا نهرين، أصبحنا ثلاثا
أطولنا وأوسعنا
هو ذلك النهر الذي
يتدفق من أجساد هؤلاء الناسٍ!

توابيت
ثمة ميدان
ومنارة
ودكان ،
في الميدان يقف الرصافي لوحده
ولم يعُدْ الى بيته بعدُ ،
وفي خاصرة المنارة
تظهر رقبة يمامة خائفة ،
وثمة فقط دكان واحد
مفتوح الدرابزن
كُتب فوقه بخط كبير رديء:
"بياع التوابيت"!

الشعر والنهر
سألني نهر: ماذا انت؟
قلت: انا سمكة، شيركو بيكەس السمكة!
قال: في اي نهر
قلت: في نهر الشعر!
قال: واذا ما جف هذا النهر؟
قلت: اذاك سأموت معه!



# الطفولة

لكي أفند الغضينة
لا أملك شيئا في الوقت الحاضر
سوى الشعر
أجعله درب التسامح والمحبة.
كي اتصدى صدأ لحظات اليأس
لا أملك شيئا الان
عدا الموسيقى
أجعله جناحا للامال والحبور.
ولكي اسدّ طريق عمري المنحدر
لا أملك شيئا وسط هذا الخريف
الا الطفولة
لأستعيدها
واجعلها حلما ابديا
وسحرا ابديا!

# الحرية

في هذا الشرق
حاولتُ جاهدا ان أضع
كلمتي "الحرية" و "المرأة"
فوق كرسيين بجوار البعض
أمام احدى المرايا، لكن دون جدوى.
ففي كل مرة
كانت كلمة "المجتمع"
يأتي بشاربه الكثيف
متأبطا سجادة الصلاة
جالس بدل "المرأة" على الكرسي!

# الانفال

في النهار
ارتديتُ "زُرقة السماء"
ابتسمت لي السماء،
حينما حلّ الليل
وهبني القمر قصائد زرقاء.
لبستُ خُضرة الصنوبر
أمست الجنائن حبيبات
بدأن تقبلانني قُبلا خضراء وحمراء،
وحينما كسوتُ "سواد الانفال"
تحولت السماء الى ضباب قاتم
والقمر سقط في كرميان
شجرة الصنوبر بدأت تنتحب
والبساتين غدتْ ارامل!



أمي..هناك، في ماوراء المحيطات

في هذا التاريخ العابث
في هذا الزمن الثلجي
لِمَ هذه الرحلة البعيدة يا امي؟

سفر تائه، اكثر تيهاً من قدر عشب في مهب الريح
سفر شريد، اكثر تشرداً من البذور المنثورة ومن ترامي النجوم
لماذا يا امي؟

في هذا الزمن العابث.. في زمهرير الرحلة
لماذا التخلي عن الشمس المعوزة في أفق تلة مامه ياره
وعن غزلان كاني آسكان وضياع صوت جبل كويزه
وتضبب مرايا عينيك
ومن ثم نحيب خيالك في ماوراء المحيط؟

لماذا الرحيل في هذا التاريخ العابث؟
حيث تبكي عزلتك وهذيانك وحزنك
في زاوية من الذكريات
امام شمعة بيضاء وحيدة ذات ضوء مرتجف؟
لماذا يا أماه.. لماذا؟

ندف الثلج تتلوى مع الرقصات
الزمن تخدّر إثر البرد.
تشبه غرفتي خشبة عائمة على المياه
وعيناي رغوة عكرة
وإحساسي يبدو وكأنه صقيع البحر المحطّم
عمري يرفرف كفراشة تقترب من شمعة أجلها
وجسدي يترهل وكأنه منحوت من الرمال
وحلمي خيوط مبعثرة

لمَ الرحلة هذه.. لماذا؟

حلمنا قصير جداً
وميناء العالم طويل
لم يزل هديره يافعاً يتحرك
اما جسدنا، فهو موقد خامد
وعيوننا آفاق ضبابية
الخيال قاربُ مكسور
واللون يسقط ورقة.. ورقة
لماذا التوجه صوب خلف المحيطات يا امي
وخلف المجهول، خلف الضياع؟

أمام نافذة حزينة
مطلة على اشجار غاضبة يائسة
تأتين وتذهبين وتقفين
في مطبخ صغير
مكسورة الجناح كطائر الذعرة
تفتحين نافذة الشرفة التي تبتسم بالكاد
تحدقين في بعض القنافذ العجولة في ثقب شجرة هرمة
وتصغين لأصوات طيور تحلق مسرعة عبر سماء نحاسية
تفتحين رأس دلو (الطرشي) لتتذوقينه قليلا
يطاردك البرد القارس، تستحيلين حزنا نكساَ
تعودين الى أدراجك في المطبخ
ترفعين أكمام ثوبك متوجهة الى حنفية ماء شرس
تغسلين الاواني والمواعين
تغسلين الخيال، تغسلين الاحزان
تغسلين السنوات التي لاتنتهي
تعودين الى الثلاجة تفتحينها وتغلقينها
تخرجين منها حزنا متجمدا كاللحوم الموجودة فيها
تضعين فيها احزانا جديدة داخل الظروف
لم هذه الرحلة البعيدة يا امي؟

إنها دائرة تدورين حولها كل يوم
دائرة من الثلج، دائرة من الدخان
دائرة من المخاض البلاستيكي، تدورين حولها
لم هذه الرحلة البعيدة؟

رحلة في بحر هائج
ركوب امواج طائشة
ضباب كثيف داخل قوالب كونكريتية
والتنفس في هواء أسود

فقط مع نفسك تتحدثين
مع أكمام ثوبك



مع الطرشي الذي في الشرفة
مع أزيز المقلاة
مع انين الاحشاء
لماذا يا أمي.. لماذا؟

في هذا العالم العابث
في هذا الزمن المشتت
لم هذه الرحلة اللعينة؟

في ماوراء المحيط...
تشبهين شجرة سرو ضائعة في عتمة الضباب
تشبهين طيرا خريفيا حاطا وقت المغيب
تشبهين مزهرية منهكة، وقصة من دون سامع
لماذا هذه الرحلة الرمادية
وهذا السفر الدامع
وحيث النجوم ساهرة؟

في ماوراء المحيطات
تشبهين موجا هالكا وقت جزره
وأصدقاؤك هم:
اشجار مستاءة
قنافذ من فيرجينيا
طيور نازحة
عابرو سبيل في الطرقات الخالية
وشبابيك هنا وهناك.

لم هذه الرحلة الطويلة يا أمي؟
رحلتك تنثر ثلوج العمر
في هذا الحلم القصير
لماذا يا أمي.. لماذا؟
تأتين من امام النافذة
تتوجهين نحو الشرفة الصغيرة
نظراتك تشبه ماء عكرا
ترين عاصفة تطارد سحابة نائية مم
وحفيف من احشاء الاشجار، وفي ا



مطر يسقط في الخارج حيناً
ودموع تنهمر من الداخل حيناً
يسيلان معا من رأسك
المطر يبلل اعشابا صفراء
والدموع وردة منحنية الرأس من على زيك الكردي
ترين من الاعلى الى الاسفل قبعة واحذية رجلين
تستمعين اليهما لكنك لاتفهمين ما يقولانه
مرة اخرى تنظرين الى القنافذ في ثقب شجرة هرمة
ترمين اليهم الجوز، فتتدحرج كرات الجوز
وتمسحين مع تدحرجها قطرات متدحرجة على خدودك
بأكمام ثوبك الكردي
تأتين الى الثلاجة تفتحينها وتغلقينها
تتعبين كالشجرة الهرمة امام عاصفة الريح.
حينذاك تجلسين على كرسيك
تمسكين بمجهر كبير
تعاودين النظر بصور ألبومك العتيق
تنظرين الى أبنائك وبناتك المغتربين
والى مدن جد بعيدة
الى ابناء اولادك وبناتك والى ازواجهم
تنظرين الى حظك الذي يشبه مرآة مكسورة
تنظرين الى خريف قامتك
وسقوط ريشة جناحيك
وذبول ساعات أيامك
ترمين البوم الصور جانبا
تبدأين بعدّ امراضك بالاصابع
تأخذين العذاب والحبوب والذكريات معا
الى سريرك
تغضين الطرف كجناحي فراشة
فيستكين الالم برهة
تتثاءبين وتأخذك الغفوة
تدخل ابتسامة في بياض نومك
تعودين الينا مع غيمة هادئة رؤومة من فوق البحر.

في هذا الزمن العابث
في هذا الزمن الثلجي
لم هذه الرحلة البعيدة يا أمي؟
رحلة بلا عودة
ركوب موجة متوحشة
وحيث افواه القرش المفتوحة
عاصفة هوجاء
قارب بلا شراع
تناجين مع نفسك ومع المطبخ والقنافذ والنوافذ...
الاحلام تتراءى داخل البوم الصور وداخل الثلوج
الانتظار داخل حقيبة عميقة
التنفس في اسطوانة كونكريتية
الى متى يا أمي.. ولماذا؟

# شيركو بيكه س:
# أن تبقى الحرية شامخة في هذا العالم العنيف



حاوره: سامي داود



كانت " مرايا صغيرة " بمقاطعها الشعرية القصيرة، أولى إنعكاسات الألم الكردي في التجربة الشعرية لشيركو بيكه س، إذ أيقظ من خلالها ما يجعل من الأشياء الجامدة الأكثر عادية في محيطنا اليومي، مستشعرة للوجع الكارثي الذي قيض للكردي أن يعيش حياته وفقا لهذا الوجع. لذلك تكلمت التفاصيل عن العنف و القمع و الأنوثة و الرومانسية الثورية كأنها تسرد لنا سيرة الأشخاص الذين تركوا بصماتهم و آثار عشقهم عليها قبل موتهم. لم يترك بيكه س شيئا جامدا إلا و أقام فيها روحيا. نوع من تلك الحلولية التي ظهر من خلالها المتخيل الجذري لربط الفكر بالشيء في بلاد الرافدين. فانتحرت المحبرة التي غمس فيها الطاغية ريشته ليعدم بها براءة الحياة. و صار الكرسي راويا على غرار الرواة الملحميين المسكين بخيوط الحكايات المتقاطعة لحيوات لا يكتمل معناها بدون الإحالة إلى حيوات أخرى، و جاءت القلادة لتناقش فكرة الأنوثة في الرمزية المجتمعية، و هكذا دواليك. بات الشيء في سياق استخدامه " هايدغر" راويا للرؤى. في خضم الفوضى و الغضب الذي يلحف بالعالم و بطريقة التفكير بالحدث التاريخي. اقترحت على بيكه س أن نهمس معا حول الشعر؛ هذا الأجنبي ـ الشعر ـ الذي وجد فيه إدغار موران خلاص البشرية. فكان لنا البوح الآتي:

**ـ سامي : تكتب الشعر كأنك تتنفسه. تعايشه يوميا بأوراق بيضاء مفردة و قلم رصاص و سجائر متتابعة. ألا ينهكك هذا الشغف اليومي بالشعر..؟**

ـ بيكه س : لا أبدا. لا إنهاك و لا ملل و لا توقف. و ذلك لأنني عاشق للقراءة و لمتابعة النصوص الجديدة. و ثانيا لأنني مجنون بكتابة الشعر. فأنا أسافر يوميا داخل اللغة. أسافر لعوالم مختلفة كليا عن العالم المادي. و ما أراه داخل اللغة و أستكشفه، لا أجده داخل واقعنا اليومي. إنني أكتب المجاز و أسافر مجازا بالصور عابرا القارات إلى العوالم الأخرى. و هذا القطار البخاري الشعري لا يمكنه السير دون دخان سجائري. لقد تزوجت الشعر و هذا أكبر من الشغف اليومي. نعم إنني أتنفس جسد هذه الزوجة و روحها. أكتبها بقلم الرصاص، حتى إذ ما وقعت في خطأ ما، امسحه على الفور لئلا تشعر بأنني أهملها. فأنا لا أشطب الصيغ التي لا تعجبني بل أمسحها بالمحاة. كل شيء يبدأ أبيضا و من ثم تاتي الألوان تباعا. جنون و حب و شغف. و الشيء الوحيد الذي بإمكانه أن يوقفني هو الموت. و هو لا يبلغني بقدومه، بل يباغت. و لأنني لا أعلم بمجيئه مطلقا فإنني أجد في هذه الجهالة شيئا مفرحا.

**ـ سامي : ضمن كتاب مشترك كتبه عالم الاجتماع الفرنسي إدغار موران بالإشتراك مع ستيفان هيسيل بعنوان " المتذمرون " وجد موران أن خلاص البشرية يمكن في الشعر. و لم يقصد بذلك فن الشعر، بل و إنما المضمون الإنساني الذي يقترحه الشعر للحياة. أتعتقد ، و ضمن هذه الفوضى التي تغلف العالم، أنه مازال الشعر قادر على إحداث فرق جوهري في حياة الإنسان المعاصر..؟**

ـ بيكه س: نعم. إن المقصود به لدى " موران " هو هذا الجوهر الذي يتضمنه الشعر، من البراءة و النقاء و الصيرورة اللانهائية للحب. الشعر مرادف آخر للحب. و خلاص البشرية يأتي من خلال الحب. أليس هذا بالأمر الصحيح.؟ إن قاتل البشرية هو الكراهية و العنف و التطرف الذي نراه يوميا في بقاع العالم. روح الشعر هو المحبة و التسامح و السلام، و خلاصنا بالشعر يعني استنهاض قيم البراءة فينا. لذا، فالبشرية بحاجة إلى نوع من العودة إلى طفولتها المبكرة و أن تترفع على الجشع و السلطة المطلقة و التوجهات الدموية. في العالم الشعري... و كما تعلم فإن جميع اليوتوبيات النظرية في التاريخ هي طروحات شعرية. إن روح تلك العوالم الشفافة الجميلة مأخوذة أساسا من الشعر. و باعتقادي فإن أنقى الموقف الشعرية و أجملها هي تلك ظهرت في المرحلة لرومانتيكية و من ثم السريالية؛ الرومانتيكية كانت ضحية الحروب الجهنمية الكبرى. و قد جاءت السريالية لتكشف لنا قبح الواقعية المتسلطة. و الأهم كان تفجيرها للغة و لتركيب الجملة الشعرية، حيث قلبت اللغة التقليدية رأسا على عقب. على أية حال. هنا ليس المقصود بهذا الكلام الشعر ذاته لتغيير العالم.؟ فماذا باستطاعة الفراشة أن تفعل في هذا العالم الوحشي.

**ـ سامي :استخدامك لقلم الرصاص في الكتابة. أهو ارتباط بالحالة الطفولية في الكتابة. حيث الشطب و الحذف جوهر الكتابة.؟ لكي يظهر ما نكتبه أجمل و أكثر إتقانا. أم إن الرصاص يوفر لك إحساسا بريا طليقا في الكتابة.؟ أم ماذا .؟**

ـ بيكه س: كلها مجتمعة. فحرية أصابعي مهمة جدا. إنني أشعر بالإنطلاق و البرية في الكتابة حين أكتب بلقم الرصاص. بينما عندما أستخدم قلم الحبر و لا أستطيع أن أمسح ما أريد بالممحاة حينها أشعر بأنني مقيد اليدين. و كما تعرف فإنني لا أستعمل الكمبيوتر مطلقا و ذلك لأنني أشعر آناء الكتابة بأن أصابع غيري تكتب بدلا عني. طبعا، هناك شعراء و كتاب لا يستطيعون كتابة جملة واحدة إلا بالكمبيوتر. إنها نسبية التعود على استعمال أشياء ما في حياتنا. ربما الكمبيوتر أسرع. لكنني و كما تعلم أمضيت ردحا طويلا من عمري في المنحدرات و لا استطيع العودة مرة أخرى متسلقا هذه الأمور. لذلك أكتب باليد. و كما تقول أشعر بالحالة الطفولية في ذلك، فالطفولة هي النبتة الأولى و نحن بحاجة الآن لكي نستشف منها الشعر كي لا تجف الحياة. و الإبداع مرتبط بتلك النبتة.

**ـ سامي : قال محمود دوريش في آخر حوار له: بأنه إن استطاع أن يعود بالزمن إلى الوراء، فإنه سيحذف نصف ماكتبه. أما أدونيس فإنه يعدل النص ذاته في كل مرة يعيد طباعته. بينما كان همنغواي يعدل مرارا و تكرارا في نصه قبل تقديمه للطبع، لأنه كان يعتبر النص بعد طباعته ملكا للقارئ. متى يبدأ و ينتهي تعديل النص لديك..؟ و هل هناك نصوص تشعر بأنك نشرتها قبل إكتمالها فنيا..؟**

ـ بيكه س: لا أعلم متى قال ذلك شاعرنا الجميل محمود درويش. لكنني قبل سنوات كثيرة قلت الأمر ذاته، ربما بصياغة مختلفة لكن بنفس المعنى. و قد قلتها مرارا و بعيدا عن التواضع و المجاملة الأدبية. أنا من صنف الكتاب و الشعراء الذين يعدلون نصوصهم هنا و هناك إلى النفس الأخير قبل دفعها للمطبعة. لكن بعد الطبع ينتهي كل شيء. وحينئذ يصبح ملكا للقارئ و النقاد. آخر شيء أكتبه، يفرحني لفترة قصيرة جدا. بعد ذلك أنساه كأنني ودعته نهائيا. بعدها أشعر بأنني في فراغ و كأنني أكتب للمرة الأولى، كأنني لم أكتب شئا في السابق. أكتب من النقطة صفر في الكتابة. و لست نادما على ما كتبته سابقا، سواء أكان جيدا أم رديئا. و أشبه ذلك ألبوم صوري في مراحلي العمرية المختلفة. هناك صور حين أراها أضحك من نفسي، لكن ذلك لا يغير من حقيقة أن تلك الصورة هي صورتي حينما كنت ذاك الشخص... إن استطعت العودة بالزمن إلى الوراء لما دفعت بالكثير من قصائدي إلى المطبعة. و هذا الأمر يرجع للعجالة التي تدفع بنصوص للنشر قبل أن تنضج فنيا الحالة الشعرية عند الشاعر أو لم تكتمل الصورة لديه فيستعجل في إتمامها. بعد كتابة كل نص، و كما أسلفت أشعر بالغبطة لفترة محدودة و بعدها أعود إلى الظمأ الإبداعي مرة أخرى. و أعتقد بأن ذلك يشكل علامة مضيئة في تجربتي الشعرية، كونها أبعدتني كليا عن القناعة و الإكتفاء بما أنجزته، و إنما على العكس، منحتني هذه الخاصية ألا ألتفت إلى الوراء و التباهي به، بل أن أتقدم دائما للإمام نحو المجهول، لى الصورة التي لم أرسمها بعد و إلى الأغنية التي لم اغنيها بعد. طبعا لا تأتي كل النصوص بالمستوى الفني ذاته كأنها سرب من الطيور تطير معا بمستويات متفاوتة. إن ما يتبقى في المحصلة هي قلة من النصوص، و من خلال هذه القلة نتعرف على الشعرية في كل زمان و مكان.

**ـ سامي : أيمكننا القول أن الخلق الفني ليس مرتبطا بالإنزياح الشكلي أو الموضوعاتي، بل و إنما بالمعالجة الفريدة للموضوع و لفرادة التركيب الخاص للجملة..؟**

ـ بيكه س: الشعر الذي يفتقر إلى الفنية و اللغة التعبيرية العالية. لا تشفع له قدسية الموضوع أو العواطف أو أي شيء آخر. فالكثير من القصائد التي كتبت للثورات العربية أو الكردية كانت قصائد عادية من الناحية الفنية، و بالتالي أضرت بالوطن و بالثورات أيضا. و هذا لا يعني بالمطلق أن المواضيع الأخرى تخلق قصائد عالية المستوى، فالشعر الصوفي نظم وفقا للشكل الكلاسيكي و ليس فيها مجازفات فنية و ابتكارات شكلية، بل ظلت كما هي في النظم العادي للشعر. إن المهم هو اللغة المعبرة و المتقنة فنيا.

**ـ سامي: تتعايش و تنصهر في نصوصك عدة أجناس أدبية. و قد لاحظت في نصوص شعراء آخرين، و بعد إصدار عدة دواوين شعرية، ميل كبير للجمل الطويلة و للسرد الروائي و كذلك لترقيع بعض الفراغات النصية بتراكيب فكرية تظهر و كأنها دخيلة على النص أو محشورة في القول الشعري دون أن تتموقع فكريا في سياق الشيء المقول. أتعتقد أن مآل القول الشعري هو الجملة السردية الطويلة.؟**

ـ بيكه س : أنت تعلم جيدا، بأنني أكتب و منذ عشرين عاما المطولات الشعرية وكذلك النصوص المفتوحة، و هذه الأخيرة و وفقا لتعريفي لها،هي نصوص لا تتوقف عند جنس ادبي محدد، بل و إنما تتركب من أجناس أدبية مختلفة ضمن ذات النص. فيها الشعر والقص والمنثر والمسرح معا. وقد ترجم بعضها إلى العربية و كان من بينها ترجمتك أنت لديوان " الكرسي " الذي صدر عن دار المدى بدمشق ٢٠٠٧. و قد ترجم غيرها إلى العربية، و باعتقادي أن النص المفتوح هو النص المستقبلي للشعر أيضا.

**ـ سامي: يضاعف الشعر من إحساسنا بالأشياء في العالم، لذلك تجد الشاعر منهكا و شاحبا كأن الموت يلاصقه. و لأنك منهمك يوميا بالشعر، كيف تتحمل الواقع بكل خشونته ..؟. أم أن إنشغالك اليومي بالكتابة هو طريقك كي لا تموت بسبب الواقع كما كان حال نيتشه..؟**

ـ بيكه س: الشعر بطبيعته حسي، و مكانه في جغرافية الجسد هي الأحاسيس. وبهذا المعنى فإن الشاعر برهافته الحسية يكون كالأرجوحة المتأرجحة فوق الهاوية في هكذا زمان، تهتز هذه الأرجحة لأدنى حركة من حوله، لأخف همسة، إنه الورقة الخريفية لشجرة مثقلة الهم جراء قساوة العالم، لذلك فإن الشاعر ـ او يجب أن يكون الشاعر ملتزما بإنسانيته كأنه مسؤول عن مقتل إي عصفور و سحق أية وردة ردم أي نبع في كل مكان. ليس ضروريا أن يوجد الشاعر في وطن محدد ينتهي فيه عشقه وتتوقف عنده مسؤوليته، فعيون أطفال العالم هي موطنه، و سفك كل قطرة دم في العالم يجرح الشاعر. لكن ليس كل الشعراء إنسانيون. إنني أعتقد بأن هناك صنفين رئيسين من الكتاب و الشعراء، منهم يكتبون نصوصا إبداعية لا خلاف على أهميتها، لكنهم ليسو إنسانيين. بمعنى أن إباعهم لم يكن مصادقا لمواقفهم الإنسانية، و هناك أمثلة كثيرة في التاريخ، كآزرا باوند و جون شتاينبيك و محمد الماغوط، و هذا الأخير بدأ ناقدا للسلطة و انتهى متعصبا لها و غير إنسانيا و لا حتى ثقافيا في موقفه من القضية الكردية، بل تقدم بإفكار تدعو للإستغراب. و انت تعلم بأن بعض الشعراء كتبوا المدائح عن الطاغية صدام حسين حتى آخر لحظة في حياة هذا الدكتاتور دون أي إحترام لكرامة ضحاياه. في الطرف الآخر يوجد مبدعون إنسانيون لم يتنازلوا عن إلتزامهم الإنساني و هم الأغلبية. هؤلاء الشعراء و الكتاب هم مبدعون فنيا و أخلاقيا. وقفوا مع الحرية و تبنوها حتى الرمق الأخير من حياتهم. باعتقادي هكذا يكون المبدع الحقيقي. الآن و في هذه الأيام العصيبة و الدموية لتي يمر بها الشعب السوري، ما الذي يمكننا قوله لأولئك الكتاب و الشعراء و الفنانين الذين وقفوا إلى جانب الدكتاتور.!؟ مقارنة بالمطرب

الذي غنى ضد الطاغية فخلعوا حنجرته؟ أترك الجواب لهم. باعتقادي يتأتى شحوب الشاعر من الإنهاك الذي يعانيه بسبب العنف و المرارة التي تملأ الواقع. فمن الملاحظ في التاريخ أن حياة الشاعر كانت بمثابة الحالة النقيضة لحياة الجناة الذينتلطخت أيديهم بدم الإبداع. لكنه مصيرنا و علينا أن نجابه الواقع و نكشف له خشونته و نعمل على جعله أجمل. إن الكتابة اليومية هي نوع من العمل المقاوم. ليس دفعا للموت عني شخصي، بل لكي ندافع عن الجمال والحرية في كل مكان. ليس مهما موتي أو بقائي، بل أن تحيا الكلمة الجميلة الطيبة، وأن تبقى الحرية شامخة في هذا العالم العنيف.

**- سامي : من الخليج. من هم الشعراء الذين تجدهم الأقرب إليك.؟**

- بيكه س: هناك شعراء و شاعرات من الخيج العربي أرسلوا لي مجموعاتهم الشعرية وقد أحببتها. لكن أبرز شعراء الخليج العربي وأكثرهم قربا لي و ذو جمهور كبير في وسطنا الثقافي الكردي هما الشاعران المبدعان قاسم حداد و سيف الرحبي.

**- سامي : هل زرت أو أقمت أمسيات شعرية في الخليج العربي.؟**

- بيكه س : بدون شك. أحب و يشرفني أن أزور دول الخليج و أن اقرأ في مجالس المثقفين هناك مختارات من قصائدي عندما تحين الفرصة المناسبة لذلك. و سأكون سعيدا أن نتبادل معا إجراء الإمسيات الشعرية فيما بيننا. فقد سمعت من بعض الأصدقاء بوجود قراء كثر لأشعاري في الخليج العربي.

- سامي : لدي بعض العبارات. أريدك أن تقول فيها شيئا ما:
- النافذة ...
**- بيكه س: عيون أخرى في حياتنا**
**- العشب...**
**- بيكه س: أوتار الأرض اللامتناهية**
**- الهتافات...**
**- بيكه س: صرخات التاريخ و لا بد منها.**
**- المرآة المهشمة...**
**- بيكه س: مذكرات ميتة**



## مختارات من ديوان " الكرسي "

**ترجمة: سامي داود**

**أنا كاتب هذا النص**
**عتيق في المدينة**
**مجنون كالريح**
**حاف**
**رث**
**حائر.**

**آتي وأغدو**
**حيناً أستحيل شعراً ثملاً في حانةٍ**
**وحيناً، في خلوة صوفية،**
**أمسي قصة حدباء،**
**أوخطيئة هائمة،**
**نثر على منازل السهوب**
**مسرحٌ للجثالةِ.**

**أنا العاشق**
**لا بد أن أندف**
**بأصابع أنفاسي**
**قطن هذا الزمن.**
**لتحلق الكلمات**
**وتستحيل العبارات ريشاً**
**للرياح التائهة، المشردة**
**التي لا بيت له**
**ولامعجم.**
**أنا حلاج آلامي البيضاء.**
**في صوتي تحفظ الغربة جسدها.**
**في عيني شعاع القرابين.**
**في خيط شعري**
**عشبة حنين للوطن.**



**ديلان**
**صوت سماء ناصعة**
**جناحا نغم جليل**
**يتعالى إلى الله**
**مقامه في هيئة قمة**
**وانحدار جبل.**
**مقامه غسق يعبره صف طيور مهاجرة.**
**ترقط الثلج بظلالها**
**نقطة... نقطة**
**بصَفقها الحزين القلق.**
**مقامه خيال نهر**
**في السفح يمضي غريباً**
**وحيداً للبعيد.**
**يضع على جناحيه**
**صوت لكاثي**
**يأخذه، ويأخذه كحلم ليل طويل.**

**ممعناً في نقطة سوداء،**
**للحظات استحالت سنونواً حبيساً،**
**آنئذ رفعتُ رأسي،**
**حلق السنونو عالياً**
**أبصرتُ في سطح سماء ناصعة،**
**غيمة في سيماء كرسي،**
**نفسه، الكرسيُّ**
**وُضع قرب عرش الله،**
**منتظراً**
**أن تقعدَ عليه.. أخيراً**
**الحرية.**

# شيركو بيكەس.. بوشكين كوردستان

زهدي الداودي



هكذا كنت أسميه، سواء في لقائي معه أو في غيابه. ولا أعتقد أنه كان يحس بالزهو لذلك، إذ أنه كان يريد أن يبقى شيركو بيكه س لا غيره.

وهذا هو السبب الذي جعله أن يترك كرسي الوزارة، فبقي شيركو بيكه س الشاعر.

كان جميلاً، يحب الحياة والجمال. ويتساءل:

**"لماذا أموت أنا والنجوم لا تموت؟"**
**ويأتيه نداء يقول:**
**"وما الفائدة من بقائي بلا نجوم؟"**
**ثم يقول وهو يذوب أمام العشق:**
**"كنت تطرزين صدرك بقلادة تحمل كماناً صغيراً،**
**تتهادين أمامي رواحاً ومجيئاً،**
**كنت أسمع اللحن حين يبدأ الكمان بالعزف،**
**والنهدان النافران يرقصان رويداً رويداً"**

**ايه شيركو،**

**يتامى جئنا إلى هذا العالم، عراة نتركه، لا نملك ما نقدمه للحبيبة، سوى نرجسة قطفناها من أعالي قمة "بيره مكرون" وما أصعب أن تقطف وردة من هناك.**

**قصيدتك اللانهائية "كرسي" حزين يعلوه الغبار.**

**ديوانك "قلادة" لا تعرف أنك رحلت.**

**مجاميعك الشعرية:**

**مضيق الفراشات، ضمأي يطفئه اللهيب، صليب وحية وتقويم الشاعر، الآن وطني فتاة، فرس من شقائق النعمان وأسرع، الموت يلاحقك وغيرها**

**كلها يبكي بصمت**
**ويشيعك،**
**بنشيد جنائزي ترافقه الفراشات والطيور الملونة**
**إلى مثواك الأخير**
**أيها الشاعر الكبير**

المرتعشُ، المُنشِدُ، الجوّالُ في الطبائعِ
المائيةِ للكلماتِ، يحدّثُ الترابَ
بلسانِ الروائحِ، التي هي مَقسَمُ الكرديّ؛
وبلسانِ اللّونِ، الذي هو بنزرته روحهِ،
مأخوذاً في كلّ تدبيرٍ للصورِ بنازعِ
المُحتفلِ، كما يسرحُ في المذاهبِ
كلّها، المُؤتلِفةِ باجتهادِ الهواءِ الفقيهِ.

شيركو بيكه س: عنوانٌ لمختاراتٍ
مؤلّفها شعرٌ كرديّ.

سليم بركات



شێرکۆ بێکەس

